نـــاوی کـتێب : لێکسیکۆلۆجی
نووســـینی: پ.ی.د.عەبدولواحید موشیر دزەیی
تـــایپ: سەهەند و ساناو عەبدولواحید
دیزاینی ناوەوە: پۆلا عەبدولواحید
بەرگ: لێزان عەبدولهادی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ٢٠١١
تیراژ : ٥٠٠ دانە
شوێنی چاپ: چاپخانەی ماردین/ هەولێر
نرخ : ٣٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٧ ) ی ساڵی ٢٠١١ پێ دراوە

## ناوەرۆك:

## پێشەکی:

یەکێ لەو زانستانەی کە لە زمانی کوردیدا کەمی لێکۆڵدرابێتەوە زانستی لێکسیکۆلۆجییە،لێکسیکۆلۆجی زانستێکی زمانییە لە ڕووی بنچینە و پێکهات و گەشە و گۆڕان واتاوە لە وشەکانی زمان دەکۆڵێتەوە،لێکسیکۆلۆجی ئەو زانستە گرنگەیە کە ناتواندرێت فەرامۆشبکرێت لە لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکاندا و هەنگاوێکی گرنگە بۆ دانانی فەرهەنگ، بێگومان لێکسیکۆلۆجی گرنگی خۆی هەیە لە هەموو زمانێکدا بەتایبەتیش زمانی کوردی بۆ ئاشنابوون بە لێکسیکەکانی زمانی کوردی و دەستنیشانکردنی سەرچاوە و کانگەی وشەکان، چونکە زۆرجار نەشارەزایانە و بەهەڵە دەگوترێت ئەم وشەیە عەرەبیە یان فارسیە.....هتد، چونکە وشەکەی لە ناو زمانی عەرەبی یان فارسی یان تورکی دیوە،لە راستیدا بوونی وشەی هاوبەش لە نێو زمانەکان کارێکی سروشتییە لەبەر کارتێکردن و نزیکایەتی لەگەڵ یەك یان ئەو زمانانەی کە لەیەك خێزان پەیدابوونە ئەمەش نەك تەنها لە زمانی کوردی دا بەدیدەکرێت، بەڵکو هەموو زمانێك وشەی بێگانەی تیایە.مەبەست لەم کتێبە ناساندنی لێکسیکەکانی زمانی کوردیە یە بەخوێنەران تاکو ئاشنایەتی و شارەزایی ئەوەیان هەبێت کە بە وشە رەسەن و خواستراوەکانی زمانی کوردی ئاشنابن و ببێتە مایەی سوودمەندیش بۆ فێرخوازانی بەشەکانی زمانی کوردی لە زانکۆکاندا، چونکە لە راستیدا ئەم کتێبە بەشێکە لە کۆکراوەی ئەو وانانەی کە لە بابەتی لێکسیکۆلۆجیدا گوتوومەتەوە لە بەشی زمانی کوردی کۆلیژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین و کەمی سەرچاوەش لەم بوارە بوو بە هاندەرم بۆ دانانی ئەم کتێبە، کە هیوادارم ببێتە مایەی سوودمەندی بۆ خوێنەرانی.

دانەر

پ.ی.د.عەبدولواحید موشیر دزەیی

Dr.abdulwahiddezaye@yahoo.com

## بەشی یەکەم: لێکسیکۆلۆجی و بوارەکانی:

### ١- پێناسەی لێکسیکۆلۆجی:

لێکسیم (lexeme) وشەیەکی رووت و دابڕاوە چەند بەکارهێنان و واتایەکی هەیە (محمد علی الخولی:١٩٩١:١٥٢) زانستی زمان سەلماندوویەتی کە زمان دارشتەیەکە و ئەم دارشتەیەش بەرهەمی یەکگرتنی توخمەکانی وشە و زاراوە و ڕێزمان و ...هتد. لێکسیکۆلۆجی Lexicology وەك زانستێکی زمان گرنگی بە وشە دەدات لە رووی دارشتن و گەشە و گۆڕانی واتا و فرەواتا و هاوبێژەکانی (محمد علی الخولی ١٩٩١:١٥٤) کەواتە لێکسیکۆلۆجی گرنگی بە واتای وشەکان و ئەو سەرچاوانەی کە وشەکی لێدروستبووە دەخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو گەشەو گۆڕانکاریانەی کە بە درێژایی مێژوو بەسەریدا هاتووە لەگەڵ جیاکردنەوەی وشەی رەسەن و نارەسەن و بەکارهێنراو و مردوو.

ئەرکی لێکسیکۆلۆجی لێکۆڵینەوەیە لە وشەکانی زمان لە رووی:

١- واتا.

٢- شوێنییان لە یاسای گشتی زماندا.

٣- پەیدابوونی.

٤- بەکارهێنانی.

٥- دەرفەتی جێکردنەویان لە ئاخاوتن.

٦- جۆری دەربڕین و شێوەی چەسپاندنیان لە رەوانبێژیدا. (نەورەحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:٢).

بۆ نموونە لێکسیکۆلۆجی بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ وشەی (خاوێن) دەکات:

خاوێن : پێکهاتووە لە (خا + وێنە).

(خا) لە پەهلەوی (خایك) بووە و (خا) لە کوردی فەیلی واتای (هێلکە) دەدات و ئاشکراشە کە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی هێلکە پاکی و سپێتییە،(وێنە) واتای

(وەك) دەدات و (ە) كرتاوە.بۆتە (وێن).جا وشەی خاوێن واتای ئەوە دەدات (پاكە وەك هێلكە یان سپییە وەك هێلكە).(جەمال نەبەز:٢٠٠٨؛٢٥١).(خاوێن) لەگەڵ (پاك) هاوواتایە و لەگەڵ (پیس) دژواتایە و (خاوێن) فرەواتایە بە واتای (باش) و (رابردوو پاك)، دێت.

- ئۆتۆمۆبیلەكەی خاوێنە واتە: ئۆتۆمۆبیلەكەی باشە.
- رۆژگار كەسێكی خاوێنە واتە: رابردووی پاكە.

## ٢- لێكسیكۆلۆجی و هاوسێكانی:

لێكسیكۆلۆلۆجی هێمایەكە لە رووی فۆرم و ناوەڕۆكەوە لە وشە لێكسیكییەكان دەكۆڵێتەوە بەواتایەكی تر لە رووی وشەسازی و واتاسازییەوە لە وشە دەكۆڵێتەوە لە رووی مێژووی و ئێستاییەوە ئەم هێلكارییەی خوارەوە شوێنی لێكسیكۆلۆجی لەناو زانستە زمانییەكان دەخاتەڕوو:



**أ- لێکسیکۆلۆجی و زاراوەسازی:**

زاراوە ڕێکەوتنە لەسەر واتای وشەیەك بۆ شتێکی دیاریکراو کە پێشتر ئەو واتایەی نەبووە کە لەگەڵ واتا فەرهەنگییەکەی یەکناگرێتەوە،زاراوە جۆرێکە لە وشەی تایبەت بە بابەتێك لە بابەتەکانی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری کە لە کاروباری ڕۆژانەدا بەکاریدێنن.(کامل حەسەن بەصیر:١٩٩٠:٥١٧)

١- زاراوە چەشنێکە لە وشە.

٢- زاراوە تاقمێك لە کۆمەڵانی خەڵك سازی دەکەن.

٣- زاراوە واژەیەکی نوێیە و دوو واتا یان پتری هەیە.

٤- گواستنەوەی وشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر کەوابوو هەموو زاراوەیەك وشەیە، بەڵام هەموو وشەیەك زاراوە نییە. (کامل حەسەن بەصیر: ١٩٧٩:٤٢ تا ٤٤).

پەیوەندی لێکسیکۆلۆجی بە زاراوە ئەوەیە، کە زاراوە جۆرێکە لە وشە، بەڵام ئەوەی لەیەکیان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە زاراوە وشەیەکی نوێیە و دەستەیەك لە خەڵك دای دەنێن کەچی لێکسیك بەرهەمی هەموو خەڵکە نەك تاقمێك، لە لێکسیکدا گواستنەوەی واتای تیانییە لە وشەیەك بۆ وشەیەکی تر، بەڵام لە زاراوەدا گواستنەوەی واتا مەرجێکی سەرەکییە بەم پێیەش زاراوە لە ئیدیەمدا نزیکە، تاکە جیاوازی ئەوەیە ئیدیەم لە لایەن هەموو خەڵکەوە بەکاردێت نەك تاخمێك کەچی زاراوە تاخمێك بەکاری دەهێنن و تایبەتە بە زانستێك لە زانستەکان.

**ب- لێکسیکۆلۆجی و وشەسازی:**

لێکسیك تاکە وشەیەکە کە واتایەکی فەرهەنگی هەیە و دانەیەکی زمانی دابڕاوە واتایەکی فەرهەنگی هەیە هەر گۆڕانێك لە فۆڕمدا ڕوویدات لە واتاش ڕوودەدات، لێکسیکۆجی بەشێکە زانستی زمان و لەبارەی ئێستا و ڕابردووی وشەوە دەدوێ

لە لێکسیکۆلۆجیدا کاری پێویست و گرنگ زانین و ناسینی وشە و وشەکانی زمانە، بەڵام وشە دەربڕینێکی جێگیرە و پێکهاتی ناوەوەی ناگۆڕدرێت کە لە شێوەی سادە و لێکدراو و دارێژراو و ئاوێتە دەبینرێت وشە دەتوانێت پێشگر و پاشگر وەربگرێت وشە بە دوو شێوە دەبینرێت وشەی ناوەڕۆك و وشەی ئەرکی یان وشەی مۆرفۆلۆجی و وشەی رستەیی (محمد علی الخولی:١٩٩١:٢١٠) وشەسازی وشە دەکاتە هۆیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە دەستوور و رێزمان (کامیل حسن بەصیر:١٩٧٩:١٠) بۆ نموونە ئەگەر لێکسیکی (پاك) وەربگرین جیاوازە لە وشەی (پاك:خاوێن) (پاك: نوێ) (پاك: دڵسۆز) (پاك: هەموو)....هتد. ئەم وشانە هەمووی لێکسیکی (پاك) پێکدێنن، کە لە فەرهەنگدا بەوشەیەکی سەرەکی دادەنرێت و بە کەپیتەڵ دەنوسرێت لە زمانی ئینگلیزیدا، ئەوەی بەلای مۆرفۆلۆجیەوە گرنگە ئەوەیە کە ئەم وشەیە ئاوەڵناوی سادەیە لە پلەی بەراورد دەبێتە (پاکتر) و لە پلەی باڵا دەبێتە (پاکترین) و ...هتد، بەڵام ئەوەی بەلای لێکسیکۆلۆجییەوە گرنگە ئەوەیە ئەم وشەیە لەگەڵ (پاقژ) هاوواتایە (synonym) و هەندێ جار بەواتای (هەموو) یان (تێکڕا) دێت بەمەش دەبێتە وشەیەکی هاوبێژ (homonym).(نەوڕەحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:٢).کەواتە ئەوەی ئەم دوو بابەتە بەیەکەوە دەبەستێتەوە ئەوەیە کە کەرستەی لێکۆڵینەوەی هەردووکیان وشەیە،ئەوەی لە یەکیشیان جیادەکاتەوە گەڕان بەدوای بنج بنەوانی وشەکە و واتا و چۆنییەتی پەیدابوون و بەکارهێنانییەتی لەگەڵ ئەم قۆناغانەی کە پیایدا رۆیشتووە.

### ج- لێکسیکۆلۆجی و فەرهەنگسازی:

فەرهەنگ پەرتوکێکە تایبەتە بە کۆکردنەوە و پۆلینکردنی تاکە وشەکانی زمان و بە شێوەیەکی تایبەت، کە تیایدا وشەکان راڤەدەکرێت و تەمومژی وشەکان دەرەوێندرێتەوە واتاسازی و فەرهەنگسازی و لێکسیکۆلۆجی بەیەکەوە گرێدەدات،

ئاشکرایە واتاسازی سێ زانست دەگرێتەوە کە بریتین لە واتاسازی و لێکسیکۆلۆجی و فەرهەنگسازی، زۆرجار واتاسازی سیمانتیك بەوە پێناسە دەکرێت کە لێکۆڵینەوە لە واتای فەرهەنگی دەکات، بەڵام لە راستیدا واتاسازی تەنها گرنگی بەم جۆرە واتایە نادات، بەڵکو گرنگی بە واتای تریش دەدات وەك واتای رێزمانی و سێبەری واتایی (واتای لاوەکی) و .... هتد،فەرهەنگسازی لقێکە لە زمانەوانی و گرنگی بە لێکۆڵینەوەی تاکەوشەکان دەدات و شێیان دەکاتەوە و لە واتای فەرهەنگییان دەکۆڵێتەوە و پۆلینیان دەکات وەك ئامادەباشییەك بۆ دانانی فەرهەنگ.بەم پێیەش دەبینین واتاسازی و فەرهەنگسازی گرنگی دەدەن بە واتا، بەمەش واتای فەرهەنگی دەبێتە خاڵی بەیەك گەیشتنی واتاسازی و فەرهەنگسازی، دەبینین لێکسیکۆلۆجیش بەهەمان شێوە گرنگی دەدات بە گەشەو گۆڕانی واتای وشەکان و ئەو پەیوەندییە واتاییەی کە بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە.

**٣- بەشەکانی لێکسیکۆلۆجی:**

**أ- ئیتمۆلۆجی** ( Etmology ):

ئیتمۆلۆجی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە کە لە پەیدابوون و وەرگرتن و ئەو دەورانەی پێدا تێپەربووە دەدوێ (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:٢٥). بۆ نموونە وشەی (نایاب) پێکهاتوو لە دوو مۆرفیم (نا) نەرێ و (یاب) کە رەگی (یافتن) فارسییە و واتای دۆزینەوە دەدات،بەمەش وشەی (نایاب) واتای نادۆزرێتەوە دەدات واتە دەگمەنە.

**١- شوێنی زمانی کوردی لە ناو خێزانە زمانەکان:**

دابرینە نوێیەکانی زمان دەکەن بە دوو بەشەوە:

A- **بنەماڵەی هیندۆئەوروپی:**

بە گرنگترین بنە ماڵە دا دەنرێت، چونکە قسەپێکەری لە هەموو بنەماڵکانی تر زۆرترە ئەم بنەماڵەیە لە سەدەی ٣-٤ پ.ز لە ئاسیا بوینەوە دوایی بە گێتیدا بڵاو بوونەتەوە، بەڵام هیچ پاشماوەیەکی مێژوویی ئەمە ناسەلمێنێت بۆ زیاتر ئەو رایە پەسند دەکەین کە شوێنی سەرەتایان ئەوروپا بێت کە مێژوونووسان سێ شوێن دەست نیشاندەکەن (سەرووی ئەڵمانیا،دۆڵی دانووب واتە دەشتەکانی هەنگاریا، سەرووی دەریای رەش واتە دەشتەکانی ئۆکرانیا،مێژوو نووسان شوێنی سێیەم زیاتر پەسند دەکەن، چونکە دانیشتوانەکانی (٢٥٠٠) ساڵ پ.ز لە خوورەوشت دەچنەوە سەر خەڵکی میستا و ئەنادۆڵ و سەرووی میسۆ پۆتامیا لە ئەنجامی پەلاماری دراوسێکان و کەش و ئاو هەوا کۆچیان کردووە.کە ئەم بنەماڵانە دەگرێتەوە:

١- هیندو ئاری کە لە دوو بنەماڵەی سەرەکی پێکدێت :

ا- زمانە هیندییەکان وەك:سانسکریتی،پراکیتی،زمانە هیندی نویێ.

ب- زمانەئارییەکان وەك وەك:فارسی،لوجی،ئەسیتی،پەشتوو.کوردی.

٢- زمانی ئەرمەنی.

٣- زمانی ئەڵمانی.

٤- گریکی کۆن وەك ئایۆنی ،ئەستیکی........و زمانانی س/٧پ.ز

٥-زمانەئیتالییەکان.وەك:ئۆسکی،ئەمبری،لاتینی،فەرەنسی،ئیتالی،ئیسپانی، رۆمانی، کە راستەوخۆ لە لاتینی وەرگیراون.

٦- کێلتی وەك:ئێرلەندی،وێلزی،بریتۆن........هتد.

٧- زمانە جێرمانییەکان:

ا-جێرمانی رۆژهەلات

ب-جێرمانی سەرەوە وەك: ئایالاندی،دانیمارکی،سویدی،نەرویجی،.

ج–جێرمانی رۆژ ئاوا وەك: ئینگلیزی،ساکسۆنی،هۆلەندی،فێلامەندی..

٨– بەلتیکی و سلاڤی:

ا–بەلتیکی وەك: وەك :لیتوانی،لاتاڤی....هتد.

ب– سلاڤی کۆن: کە رووسی و پۆلۆنی و جیکی و سربی و کرواتی و بولگاری نوی دەگرێتەوە.

**B- بنەماڵەی ناهیندۆ ئەورپی:**

١– بنەماڵەی سامی و حامی:

ئەم بنەماڵەیەش دەبێتە :

ا– سامی رۆژهەلات وەك: ئاشوری و بابلی

ب– سامی رۆژئاوا وەك: کەنعانی کە عیبری و فینیقی دەگرێتەوە و ئارامیش سریانی و ئارامی رۆژ ئاوا دەگرێتەوە.

ج– سامی خواروو، وەك: ئیسیۆپی و عەرەبی.

بنەماڵەی حامی ش دابەش دەبێت بۆ:

ا– حامی سەروو

ب– حامی رۆژهەلات

ج– میسری کۆن

٢– درافیدی وەك: تامیل، تیلەکو......هتد.

٣– ئۆرالی و ئالتایی:

ا– ئالتایی وەك: مانشو و مەغۆلی و تورکی.

ب– ئۆرالی کە سامۆیی و فینۆئوگرییش لاپی،فینی،هەنگاری،ئیستوانی و فلەندی دەگرێتەوە.

٤– چینی– تبتی وەك:تسایلەندی و بورمی و تبتی .....هتد.

٥– ملایو پۆلیبنیزی.

٦- پانتو لە کەنارەکانی زولو.

٧- سودانی و کینتی وەك: هوسا

٨- هیندی و ئەمریکی وەك: هۆجی و ئەباشی.

٩- قەفقاسی:جۆرجی.

١٠- باسك: ناوچەی بیرە نیز لە سنووری فەرەنسا و ئیسپانیا.

بەم جۆرە دەبینین زمانی کوردی زمانێکی زیندوو و سەربەخۆی ئێرانییە و زمانە ئێرانییەکانیش بەشێکە لە کۆمەڵەی هیندۆئەوروپی.

زمانی کوردی پەرەسەندووی زمانی ئاڤێستایە و بنچینەیان یەکە بۆ نموونە ئەگەر بەراوردێکی وشەکانی زمانی ئاڤێستا و زمانی کوردی ئێستا بکەین ئەو راستییەمان بۆ روونده‌بێتەوە:

| ئاویستایی | زارەکانی ئێستای کوردی |
|---|---|
| ئاتر | ئاگر، ئایر، ئاویر، ئێر |
| ئاخشتی | ئاشتی |
| ئازی | حەز |
| ئاسەنگ | ئاهەنگ |
| ئاسمان | ئاسمان، عاسمان |
| ئاکورە | ئاخوڕ، ئافڕ، ئاوڕە |
| ئاواز | ئاواز، ئاواچ |
| ئەشتە | هەشت |
| ئەسرەو | ئەرس،ئەڵسی(هەرسی)، ئەشك |
| ئاوخورنە | ئاوە وەرە، ئاوە خۆرە |
| ئایشام | ئایشا، ئادیشا، ئەوان |
| ئیوە | یوە، یۆ، یەك |

| | |
|---|---|
| ئەورە | هەور، هۆر |
| ئوشترە | وشتر، حوشتر |
| بەرزەت | بەرز، بڵند |
| بنە (لۆنە) | بن، بنە |
| تەرشن | تەژنە، تینوو |
| تەمە | تەم، (تەم ومژ) |
| پیسە | پیس، پیس(پیس و پۆخڵ) |
| چەکوش | چەکوش |
| دوشمەنە | دوژمن، دژمن، دشمن |
| زاماتە | زەما، زاوا |
| سەرە | سەر، سەرە |
| سەرەتە | سەرما، سەردا |
| کوەرگ | گورگ، وەرگ |
| گۆشە | گوێ، گوێچکە، گۆش |
| گەورە | گەورە، گەورا، گۆرە |
| ماسیە | ماسی، ماساوی |
| نەر | نێر، نیر |
| هوەر | خۆر، وەر |
| مژدەم | مزگانی،مژدە |



http://zmanikurdi.kurdblogger.com

**٢- وشەی زمانی کوردی:**

وشەکانی زمانی کوردی هەندێکیان چالاکن و ڕۆژانە بەکاردەهێندرێن وەك ئەو وشانەی کە ڕۆژانە لەسەر زارن و لە قسەکردن و چاپەمەنییەکاندا بەرچاو دەکەون،

وشەی سستیش ئەو وشانەن، کە کەم بەرچاو دەکەون و کەم بەکار دەهێنرێن.یان زمان پێویستی پێیان نەماوە کە بەرەو مردن دەچن یان مردوون :

**أ- کوردی رەسەن :**

ئەو وشانەن کە لە سەدەی نۆیەمی زاینەوە تاکو ئەمڕۆ پەیدا بووینە (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:٣٥) زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە و خاوەنی تایبەتمەندی لە یاسا زمانییەکان و بۆیەش هەندێ وشەی رەسەنی کوردی وا بەرچاودەکەوێت کە لە هیچ زمانێکدا نییە وەک:

- ئاین: دین
- بەگ: مەزن
- بلوێر: واتە بەو شتە دەلورێندرێ.
- دەنگ: لە زەنگەوە هاتووە (ز) گۆڕاوە بۆ (د).
- جلخوار: لە (جر)ەوە هاتووە کە بە واتای خووڕەوشت دێت لە کرمانجی ژووروو دا،ئەم وشەیەکە لەسەردەمی شێخ مەحمود پەیدابوو،بەو کەسانە دەگوترا کە دەیانویست دەسەلاتی عوسمانی بێنێتەوە کوردستان.بە زۆریش بە تورکی قسەیان دەکرد.
- دەستوور: لە دەستەوەر یا دەستەبەر هاتووە.
- دۆز: لە (داخوان) ەوە هاتووە و لە کوردی باکور واتای مەسەلە دەدات.
- فەرهوود: لە (فر+ هوود) فر لە فڕاندن وەرگیراوە (هوود) واتە فەرمان بەزۆرداری، واتە فەرماندان بە شت فڕاندن.
- هار: نەخۆشیەکە تووشی سەگ دەبێت.
- حانووت: لە (خانوو+تك) هاتووە.
- کەرکوك: لە (گەڕەکۆك) هاتووە.

- لەگەن: لە (لان: جێ) و (گەن: گەنیوو).بۆ دەستشۆر بەکاردەهات.
- لەقلەق: لاق لاق هاتووە.
- لەشکر: سوپا
- لوولە:
- نای: شمشاڵ
- پەرەسێلکە: پەڕە شلێر (شلێر) گوڵێکە لە پەڕەکانی پەڕەسێلکە دەکات.
- ڕێواس:
- شووتی: شفتی،شامی.
- تاس: دەفری لە مس دروستکراو.
- تەپڵ: لە تەبەقەوە هاتووە.
- توور: کیسە (توورەگە).
- توێژ.
- خەستەخانە: نەخۆشخانە، لە خستنە خانەوە هاتووە.

**ب- ئێرانی:**

کورد سەربە بنەماڵەی هیندۆئەورووپییەکانە لە خێزانی ئارییەکان کە زمانە ئارییەکانی وەك: فارسی،بلووجی،ئەسیتی،پەشتوو،کوردی دەگرێتەوە (محمد معروف فتاح:١٩٩٠:١٥٠).بۆیە بوونی هەندێ وشەی هاوبەش لەنێوان ئەو زمانانەدا شتێکی ئاساییە و ئەرك ناخاتە سەر قسەپێکەرانی کورد،چونکە نامۆ نییە لە لایان.وەك وشەی (دوور) لە کوردی و فارسیدا هاوبەشە و پاشماوەی (دوورا) ی ئاڤێستایە (رفیق محمد شوانی:٢٠٠٨:٢٠) هەندێ وشەی تری وەك: نوشتە و وەرزش، ڕۆژنامە، ناياب،.......هتد.(ساكار انور حميد:٢٠٠٩: ١١١)

**ج- هیندۆ ئەورووپی:**

هەروەکو گوتمان زمانی کوردی سەر بە بنەماڵەی هیندۆئەورووپییەکانە و ئەمەش ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە وشـەی زۆری هیندۆئـەوروپی لـە زمـانی کـوردی دا بەدیدەکرێت.وەك:مانگ moon،ئەستێرە star،دوو two،نۆ nine....هتد.(رفیق محمد شوانی ٢٠٠٨:٢٠) هەروەها چەندین وشەی تری وەك:

- ئاقار: پارچە زەوی کە بۆ خانوو دروستکردن بەکار دێت.
- بست: بەدەست.
- جوون: جوێن.
- دوێت: کچ
- گەنج:
- گەورە:
- هێلکە:
- کاسە: قاپ.
- کلیل:
- کڕاندن:
- لاق: لنگ
- لاس: کوڕی گەنج.
- مات: کپ،کز.
- پەنجەرە: دەرگا لە شێوەی پەنجەکانی دەست.
- پرد.
- ڕێ
- سەتڵ: لە (scatula) ی لاتینیەوە هاتووە.
- سنوور: مەرز.

- شەرم:
- تات: باوك.
- تەویلە.
- خەزال: ئاسكە.

**د- عەرەبی:**

هاتنە ناوەوەی وشەی عەرەبی بۆناو زمانی كوردی دەگەرێتەوە بۆ ئیسلام بوونی كورد لەسەردەمی خەلیفە عومەری كوڕی خەتاب لە نیوەی یەكەمی سەدەی حەوتەمی زاینی لە (١٦) ی كۆچی (٦٣٨) زاینی و تێكەڵاوی و دراوسێیەتیش.لەگەڵ ئەمە بەشێك لە كەلتووری عەرەبی هاتە ناو زمانی كوردی بەتایبەتیش ئەو وشانەی كە پەیوەندیان بە ئاینی ئیسلامەوە هەبوو وەك: (تەفسیر،تەقلید،جەماعەت،حەج، زەكات،زولم،سەبر،شەرح،عەدالەت، حەیا، مەزهەب،حۆری،.....هتد) جگە لە وشانەی كە لە ناو زمانی كوردیدا دەستكاری كرا وەك:(طعم– تام) و (عن قصد– ئەنقەست). ...هتد.جگە لەمەش جۆرێكی تر دەستكاری دەنگەكانیان كرا،چونكە لەگەڵ سروشتی زمانی كوردی نەدەگونجا وەك:(ث،ص،ض،ط،ظ،ذ) كە تەنها (س،ت،ز) وەرگیراون (ئیبراهیم عزیز ئیبراهیم: ١٩٨٢: ٨-٩)،دوای ئەمەش بەشێكی كوردستان بەپێی رێكەوتنی سایكس بیكۆ كەوتە ژێردەستی عەرەب و كەوتە بەر شاڵاوی ململانێ ی زمانی سیاسەت و دەسەڵاتی عەرەبی بە خوێندن و نووسینیشەوە و سیاسەتی بەعەرەبكردنیش هۆكارێكی تربوو بۆهاتنە ناوەوەی زۆر لە وشە عەرەبیەكانی وەك: (ئیدارە، ئینقیلاب،ئیسراحەت،بەدالە،ئیعدام،ئیمزا،بیتاقە،حاكم،حیزب،رەسمی،سەفەر، سەلیقە،سعات،شعور،شیعر،ضریبە،عادل،عافیەت،عەسكەر،هەڵبەتە: لە (البتە)ەوە هاتووە......هتد.

........هتد).

## ٥- تورکی و تورکی مەغۆلی:

بوونی ووشەی تورکی لە ناو زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حوکمرانی عوسمانیەکان لە کوردستان کە ماوەی (٥٠٠) ساڵێك حوکمرانیان کردوو وشەکانی وەك:(ئۆغر،قوزەلقورت،قەڵەباڵغ،قەرەداغ،قەزاتە،یاسا،قشڵە،جەندرمە،چوخم، قاتر) کە لە زمانی کوردی و زمانەکانی هیندۆ ئەورپیدا نین (نەسرین محمد فخری:١٩٨٧:٢٢) هەروەها ئاغا، ئۆکەر،یاپراخ کە لە (iprach) ەوە هاتووە.

## و-سانسکریتی:

- چادر: لە چەترەوە هاتووە و واتای خێوەت دەدات.
- چەتر:
- چارشێو: لە (چادر) ەوە هاتووە واتە چەتری شەو.
- کەر: لە کەرە هاتووە.
- مسك: جۆرە بۆنێکە.
- پەراسوو:
- پەتی: شتی پاك.
- قەنداخ: لە (کهندە) هاتووە.
- سامان: سەروەت
- سفر: لە (سۆنیا) وە هاتووە.
- سۆما.
- شەم: مۆم لە (سۆما) وە هاتووە.
- شەروال.

## ز- ئینگلیزی:

- چاکەت: jaket

- گلۆپ: globe
- سویچ: له (switch) هوه هاتووه.
- تایتڵ: سەر نێوی پەرتووك، له (title) هوه وەرگیراوه.
- تەندەر: له (tender) هوه هاتووه.
- ئێش: ئازار له (ache) هوه هاتووه.
- فەرمەسۆن: به لایەنگرانی ماڵی ئازاد دەگوترێت له وشەی (freemaason)
- هۆڕن: دەنگێکه بۆ هوشیارکردنەوه له (horn) هاتووه.
- کوشن: له (couching)
- لۆری: له (lorry)
- پەنچەر: له (pencer)
- پرۆفایل: له (profile)

## ح- چینی:

- چای:
- کاخەز: کاغەز

## گ- یۆنانی:

- دراو: له دراخمیّ ی یۆنانیەوه هاتووه.
- ئەفەندی
- ئەڵماس.
- فانۆس: چرای نەوت، له فانۆز (fanoz) ی یۆنانیەوه هاتووه
- ئەتڵەس: له بنەڕەتدا دێوێکی ئەفسانەیی بووه.که کتێبێکه نەخشەی وڵاتانی تێدایه.
- گاز: gaz
- کەرامەت:

- مێزەر: لە (میترا) وەرگیراوە.
- نامووس: لە (نۆمۆس) ەوە هاتووە.
- پیاڵە:
- پوول: لە (obolos)
- قانوون: دەستوور.
- قنارە: لە (gennare)
- قەپان: لە (گەپپان) هاتووە.
- تاپۆ: لە (تۆپۆگرافیگۆس) ەوە هاتووە.
- تۆمار: لە (tom) ەوە هاتووە واتە نەخشە کێشان.

**ی- لاتینی:**

- دکتۆر: فێرکەر.
- دینار: دیناری پارە.
- ستران: گۆرانی لە وشەی لاتینی (historie) وەرگیراوە.
- گومرگ:
- لۆبی: لە (lobia)
- مناوەرە: بەدەست جێبەجێکردن.
- کابینە: لە (capanna)
- قامووس: لە (campus)
- قاڕە: لە (quartarius) ەوە هاتووە.
- سانسۆر: لە (censor) ەوە هاتووە.
- سڵاو: لە (salus) ەوە هاتووە.

**ك- عیبری:**

- ئاخ: خاك له (هائاریێتز) هاتووه.
- ڕەبەن: له ڕەهبانەوه هاتووه که له بنەچەدا (ڕاڤقی) ی عیبرییه.
- شەیتان:

**ل- هیندی:**

- عەمبە: له (ئەنب) هاتووه.
- تەنك: له (tenuke) ەوه هاتووه.

**م- فەرەنسی:**

- عەتر: بۆن له (odeur).
- فانیله: ژێرکراس له (flanelle)
- گالۆن:
- گەراج:
- کامیۆن: لۆری گەوره له (camion) وەرگیراوه.
- کۆنترۆڵ:
- لۆج: له (loge).
- ماشێن: ئۆتۆمۆبێل.
- پاڵتۆ: له مانتۆ (manteau)
- پرۆژه: له (projet)
- قۆنتەرات: له (contract) ەوه هاتووه.
- قوماش: له (chemise) ەوه هاتووه.
- سرنج: له (seringue) ەوه هاتووه.
- سیڤیل: هاوڵاتی له (civills) ەوه هاتووه.
- شۆسته: له (chaussee) ەوه هاتووه.

- ترومپا: لە (trompe) ەوە هاتووە.

**ن- سلاڤی:**

- گالیسکە: عارەبانە

**س- رووسی:**

- ئیستیکان: لە (ستاکان) ەوە هاتووە.
- نەوت: نەفت.
- سەماوەر.
- تۆپ.
- یاقووت.
- زاکۆن: قانوون.

**ع- ئەوروپایی:**

- کەناڵ
- مەکینە.
- ماتۆڕ: لە مۆتۆڕەوە وەرگیراوە.
- پانتۆڵ
- پاتری:
- سابوون.
- ساقۆ: پاڵتۆ.

سەراو: ئەو شوێنەیە ئاوی تێدایە.

- یەخە: یاخە، ئێخە.

**ف- ئەڵمانی:**

- قاپوت: لە (kaputze)

- تانکی: له (tank) هوه هاتووه.

## ص- ئیتالی:

- زەڵاتە: لە (insalata) هوه هاتووه. (جەمال نەبەز:٢٠٠٨:٦٤ تا ٣٦٩).

## ق- زاراوەی جیهانی:

ئەو وشانە دەگرێتەوەلە ئەنجامی داهێنان و پێشکەوتن هاتوونەتە کایەوە سنووری زمانی خۆیان دەبەزێنن و دەکەونە ناو زمانی ترەوە و بە هەمان واتاش بەکاردێن.کە بەشی زۆری زاراوەی ئەوروپی دەگرێتەوە کە بۆ پێشکەوتنی باری کەلتووری و پشەسازی دەگەرێتەوە لە هەموو بووارەکان.لە هەموو زمانێکیشدا بەرچاو دەکەوێت .وەك: (ئەلەکترۆن،ئەمپێر، ئەنتەرنێت،بالۆن، تەلەفۆن، جوگرافیا،سەتەلایت،ڤایرۆس،ڤیتامین،ڤیدیۆ،مۆبایل،کۆمپانیا،کامیرا،کەلتوور ....هتد).(عبدالواحد مشیر دزەیی:٢٠٠٢:٧).

## ر- وشەی مردوو:

ئەو وشانەی کە لەکار دەکەون و بەکارهێنانیان نەماوە یان کەمە وەك: (بوێر،شۆخ،دلگیر، پەروەردە،.......هتد) ئەوا پێیان دەوترێ وشەی مردوو وەك ئەو نموونانەی کە (ئۆسکارمان) کۆی کردونەتەوە وەك: (کەبرێن، سەبرێن،نسرین،.......) کە هەندێکیان لە رستەدا واتایان روون دەبێتەوە وەك: (نسرین) کە بەواتای (خەم) دێت بۆنموونە:

ئەگەر ژنی گەورەی میری وادەبینــــــــــی
بانگ دەکا:برایم چاکە مەکێشە خەم و نسرینێ

هەرچی وشەی (کەبرێن،سەبرێن) واتایان روون نییە و لە رستەش بۆمان روون نابێتەوە وەك:

دەڵێ: خولایە نە بە کەبرێنێ نە بە سەبرێنێ.
بۆخۆت گیانان دەدەی، گیان دەسێنــــــــی

### ش- وشەی نوێباو:

ئەو وشانەن کە بۆ مانایەکی ناسراوی دانەیەك لە زمان بەکار دەهێنرێن و تازە هاتونەتە ناو زمانەوە نەچونەتە ریزی وشە چالاکەکان کە هێشتا بەتەواوەتی جێگای خوی لە ناو زماندا نەکردۆتەوە ئەوا پێیان دەگوترێت وشەی (نوێ باو) وەك: (گەوامی،راگر،دەمراست،بلّندگۆ،ئامێر،.......هتد) وشەی نوێباو لە ئەنجامی دوو هۆکار دورست دەبێ: هاتنەکایەی شت و مانا و دیاردەی نوێ لە ئەنجامی گەشەو گۆرانی زمان و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا،سەرهەڵدانی ناوی نوێ بۆ ئەو مانایانەی کە ناویان هەبووە.

### ب- واتاسازی ( Semntics ):

### ١- لێکسیك وواتا:

لێکسیك بە پێی واتا دابەش دەبێت بۆ:

أ- تایبەت: ئەو وشانە دەگرێتەوە کە یەك واتای هەیە وەك دار،بەرد، ئاسن...هتد.

ب- هاوبەش: ئەو وشانە دەگرێتەوە کە زیاتر لە واتایەکیان هەیە و دەبنە دو بەش:

**أ- فرەواتا Polysemy :**

وشەیەکە زیاتر لە واتایەکی هەیە،بەلاّم واتاکانیان لە بنجەوە لەیەك نزیکن و بەیەك وشە لە فەرهەنگدا دەنووسرێن (کلود جرمان و ریمون رویلان:١٩٩٤:٤٠ ) یان هەروشەیەك کە زیاتر لەواتایەکی هەبێت بێی دەوترێت (فرەواتا) (Crystal:1992:307) وەك:

رۆژ (١) (رۆژەکانی هەفتە)

رۆژ (٢) (خۆر)



**ب- هاوبێژی Homophone :**

ئـەم وشـانە دەگرێتـەوە کـە واتاکانیـان لـە یەکـدوورن و لـە وشـە فرەواتاکـان دروسـتبوون (محمد مەحوی:٢٠٠٩:١٠٨) واتاکـانیش لەبنـچینەدا بـۆ دوو وشـەی جیـاواز دەگەڕێنەوە واتە هەڵقولاوی یەك ڕەگەز و بنچینە نین (محمد معروف و صباح رشید:٢٠٠٦:٦٨) کە لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان بە ڕەگەزدۆزی تـەواو ناسـراوە (کـورش صـفوی:٢٠٠٦:٥٢) وەك:

مار(١) (ماڵ)

مار(٢) (مار)




ئەمیش دەبێتە دوو جۆر:

١- ئـەو وشـانەی کـە لـە نوسـیندا یـەکن، بـەڵام لـە گۆکردنـدا جیـاوازن ،بـۆ ئـەم مەبەستەش هێز ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە وەك:

دوو ڕوو (١) (منافق)

دوو ڕوو (٢) (وجهان)

٢- ئەو وشانەی کە چەند واتایەك دەدات، بەڵام واتاکانیان لەیەك دوورن (محمد معروف فتاح :١٩٩٠:١٧٠) وەك:

ئازار (١) (مانگی مارت)

ئازار(٢) (ئێش و ژان)

ڕێژەی هاوبێژی لە زمانێکەوە بۆ زمـانێکی تـر دەگـۆڕێ بەتایبـەتی لـەو زمانانـەدا بەدیدەکرێت کە وشەی یەك بڕگەییان زۆرە وەك:زمانی ئینگلیـزی و فرەنـسی ئـەو زمانەی وشەی لێکدراوی زۆر بێت ئەوا وشەی هاوبێژی کەمە.فرەواتایی پەیوەندی بە بەکارهێنانی وشەوە هەیە.تا وشەیەك زیاتر بەکار بێت ئەگـەری ئـەوەی زیـاترە بێتە فرەواتا.وشە فرەواتاکان وشەی یەك بڕگەی کورتن،فرەواتـایی قۆناغێکـە بـۆ

هاتنەکایەی هاوبێژی، چونکە لە سەرەتا واتاکان لەیەک نزیکن و دواتریش دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە هاوبێژی. فرەواتایی دوو سەرچاوەی هەیە:

أ- گواستنەوەی واتا بە خوازە و خواستن دەکرێ وەک گواسنەوەی ملی مرۆڤ بۆ ملی شوشە، چونکە لە شێوە و ئەرک لەیەک دەچن (محمد معروف فتاح:١٩٨٦:١١٠).

ب- هاورێیەتی کە لە ئەنجامی هاورێیەتی و بەیەکەوە هاتنەوە واتاکەی دەگۆڕێت وەک:

- ساناو (سێو، گوشت،ئاو،جگەرە،سوێند،پارە) ەکەی خوارد.

لەم رستەی سەرەوە وشەی (خوارد )چەند جۆرە واتای هەیە بەپێی رستەکە.

فرەواتایی و هاوبێژی گرنگیان وەک یەک نیە.فرەواتایی ئابووریە لە وشە و نەبوونی توانای زمان کەم دەکاتەوە و ژمارەی وشەی فەرهەنگ زۆردەکات، بەلام هاوبێژی بەشێکی گرنگ نیە لە زماندا، چونکە لە چالاکی زمان کەم دەکاتەوە و ئەرکێکی زۆر دەخاتە سەر ئەو کەسانەی فێری زمان دەبن.ئەم ومژ دروست دەکات. ئەم ومژ لە ئاخاوتن نیە، چونکە دەورووبەر دەیرەوێنێتەوە، بەلکو تەنها لە نووسیندا هەیە. فرەواتا و هاوبێژی لەیەک ئاستی زماندا نابینرێت تەنها وشە ناگرێتەوە،بەلکو مۆرفیمە بەندەکانیش دەگرێتەوە،بۆ نموونە پێشگری (دا) واتای بەرەو ژێربوونەوە دەدات لە وشەکانی(داگرت،دابەزی،داکەوت)، بەلام لە وشەی(داپلۆسی) واتای لێدان دەگەیەنێت و لە وشەی (دابڕی) واتای دوورخستنەوەی شت دەگەیەنێت و لە وشەی (داگیرساند) واتای بەرە و سەرەوە دەگەیەنێت (محمد معروف و صباح رەشید:٢٠٠٦:٧٢).

ج- گواستراوە: ئەو وشانە دەگرێتەوە کە لەسەرەتا واتایەکیان هەبووە دواتر لەبەر بوونی پەیوەندی گواستراوەتەوە بۆ واتایەکی تر.

د- لەخۆوە: ئەو وشەیە دەگرێتەوە کە لەسەرەتا واتایەکی هەبووە دواتر بۆ واتایەکی تر بەکارهاتووە کە هیچ پەیوەندی پێوە نییە.

هـ- دروست: ئەو وشانە دەگرێتەوە کە بۆ واتا بنچینەییەکە بەکارهێنراوە.وەك گوڵ بۆ تەنی گوڵ.

و- خوازە: ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە بەواتا بنچینەییەکی بەکار نەکارهاتووە ئەمەش لە ئەنجامی بوونی پەیوەندی لە نێوانییان. وەك ناونانی شێر بۆ مرۆڤێکی ئازا.

٢- **پەیوەندی واتایی نێوان لێکسیکەکان** (Sense Realation):

ئەم پەیوەندییە بە پەیوەندیی شوێنی ناسراوە کە بریتی دەبێت لە پەیوەندیی وشە بە وشەکانی پاشتر و پێشتری خۆی،بۆنموونە:هەموو ئەو پەیوەندیانە دەگرێتەوە کە وشەی(سێو) لە بەکارهێنانەکانیدا دەیبەستێتەوە بە وشەکانی تر (Jean Aitchison :1993:81) لە رستەیەکی وەك:

- ئازاد (سێو) ەکەی خوارد.

ئەم جۆرە واتایە دوو وشە یان زیاتر بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لە ناوەوەی زماندا کاردەکات و واتای هەر وشەیەك دیار ناکرێ،تاکو وشەکانی دەوروبەری نەزاندرێ، چونکە وشەکانی دەوروبەر مانای تاکە وشەکە روون دەکەنەوە و بە واتایەکی تر واتای فەرهەنگی هەر وشەیەك بەشێکە لە واتاکەی لەناو رستەدا.

(سۆسێر) لەو باوەرەدایە کە زمان پەیرەوێکی پەیوەندیە کە وشەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و نرخی هەروشەیەك لەو شوێنەدایە کە تیایدا بەکار دێت (وفاء محمد كامل:١٩٩٧:٢٢٦)، هەر بۆیەش ئەم دوو رستەیەی خوارەوە نابنە هاوواتا:

١- رزگار ئازاد دەناسێ.

٢- ئازاد رزگار دەناسێ.

واتای وشە بریتییە لە ژمارەی بەکارهێنانەکانی (کلود جرمان و ریمون رویلان:١٩٩٤:٤٦) هەر بۆیەش هەندێ لە زمانەوانان لەو باوەرەدان، کە یەکەی سەرەکیی واتا رستەیە نەك وشە، چونکە واتاکەی روونترە (بالمر:١٩٨١:٢٦)وشە واتایەکی چەسپاوی نییە و بەگوێرەی شوێنەکەی دەگۆرێت (لاینز:١٩٦٨:٤).کەواتە واتای رستە تەنها بە واتای وشەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵکو بەهەموو ئەو واتایانەش بەستراونەتەوە کە لەگەڵی بەکاردێن (میشال زکریا:١٩٨٠:٢١١).بەمەش شارەزای هەموو بەکارهێنانەکانی دەبین (عزمی اسلام:١٩٨٥:٦٦) کە لە کۆمەڵدا باوە، بەم پێیە واتا لە کێشەی چەمك و وێنەی هۆشەکی و هەست و سۆزی کەس دوور دەخاتەوە کە سنووردار نەبوون و واتایان لە ئەڵقەیەکی بەتاڵ دەسووڕاندەوە.بەمەش لێکۆڵینەوەکانی واتاسازیان بەرەو بابەتی برد، چونکە لە سنووری زمانەوانی دەرناچێت.دەرکەوتنی وشە لە هەر رستەیەکدا دەبێت دوو جۆرە پەیوەندی رەچاو بکرێت:




## أ- پەیوەندی ستوونی (Paradigmatic):

مەبەستمان لە پەیوەندی ستوونی پەیوەندیی وشەسازیی نێوان وشەکانە کە دەتواندرێت لەجیاتی دابنرێت یان وشەیەك بە وشەیەکی تر ی هاوئەرك لە

بگۆردرێتەوە بێ ئەوەی کار لە پەیوەندی ئاسۆیی رستەکان بکات، ،بەواتایەکی تر بریتییە لە پەیوەندیی نێوان وشە پێکهێنەرەکانی رستە لەگەڵ وشە نادیار و لەبەر دەست نەبووەکانی نێو رستە (عبدالواحد مشير دزهيى :٢٠٠٧: ٤٥) بۆ نموونە رەستەیەکی وەك:

– ئەو بەیانی دێت .

هەر یەك لە وشەکانی ئەم رەستەیە پەیرەوێك لە دەرەوەی ئەم رستەیە دروست دەکەن.بۆ نموونە جێناوی (ئەو) لەگەڵ جێناوی تری وەك (من،تۆ،ئەوان....هتد) پەیوەندی هەیە و پۆلێکی پەیوەندیی وشەسازی دروست دەکەن کە جێناون ، کەواتە ئەم جۆرە پەیوەندیە لە زماندا پۆلینمان بۆ دەکەن لە چەندین پەیوەندی وەك هاوواتایی و دژواتایی و گرتنەوەدا.. هتد:

١– **هاو واتا** Synonymy :

هاوواتا بریتیە لە دوو وشە یان زیاتر کە یەك واتایان هەبێت (نورالهدى لوشن :١٩٩٥: ١٠٦) ، وەك: جوان،رەند...هتد،ئەو کچە(جوانە،رەندە، شۆخە، قەشەنگە) پەیوەندی نێوانیان شوێنی ستوونییە و یەك واتایان هەیە،بەڵام زۆربەی بیروڕاکان ئاماژە بەوە دەکەن لە زماندا دوو وشە نیە یەك واتایان هەبێ،چونکە ئەگەر دوو وشە وەك یەك بن لە توانای کەم دەبێتەوە بۆیە بەرای ئەمان تەنها(خوێ:Nacl) هاوواتان ،ئەمیش لەبەر کۆتی واتای شێوازی ناتواندرێت بە هاوواتای تەواو دابنرێت،چونکە واتا لاوەکییەکان رێگرن لەبەردەم هاوواتابوون (نارا على ئەحمەد:٢٠٠٨:١٠٢)،بەڵام هاوواتای ناتەواو نکۆڵی لێناکرێ، چونکە هەر فەرهەنگێ بگرین ئەوا واتای وشەکانی بە بەچەند وشەیەکی تر لێکدراوەتەوە.

### أ- سەرچاوەی دروستبوونی هاوواتا:

ئاشکرایە کە زمان بەردەوام لەگەشە و گۆڕاندایە جا بەهۆی ئەم گەشە و گۆڕانە پێشکەوتنی ئەم زمانەش هاوواتاش پەرە دەسێنێت و گەشە دەکات،جا پەیدابوون و گەشەسەندنی دانەکانی زمانی کوردی وەکو هەموو زمانەکانی تر لە دوو رێگەوە سەری هەڵداوە :

أ- رێگەی راستەوخۆ:بەهۆی هەڵێنجانی ووشەی کوردی رەسەنە لە ناو زارەکانی زمانی کوردیدا.

ب- رێگەی لاوەکی:ئەویش بە وەرگرتنی ووشە لە زمانی بێگانەوە (ئەورحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:٢٦)

سەرچاوەی دروست بوونی هاوواتا دەگەرێتەوە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- بوونی چەند دیالێکت و بەشە دیالێکت لە زمانێک دا وەك:(لووت،کەپوو، قـژ، پرچ،باسك،قۆل)

٢- لە ئەنجامی بەکارهێنانی دوو شێوازی جیاواز یان بەکارهێنانی زاراوەی جیاواز وەك:(جەناب،بۆ،خوێ،سۆدیۆمی کلۆرید) (محمد معروف فتاح: ١٩٩٠:١٧٦)

٣- بەهۆی خواستنی ووشەی بێگانە کەلە پاڵ ووشە رەسەنەکە بەکاردەهێنرێت وەك:(مەردووم، ئینسان،مرۆڤ ، فەقیر،هەژار) (ئەورحمانی حاجی مارف:١٩٧٥:١٧٦)

٤- هەندێك ووشە هاوواتان،بەڵام تاکێکیان لە چەند فرێزێك دا بەو واتایە دێت وەك:لە رستەی خۆی شاردەوە دەتوانین بڵێین خۆی مەڵاسدا،بەڵام لە رستەی کتێبەکەی شاردەوە وشەی مەڵاسدا ناتوانین لە شوێنی (شاردەوە) دابنێین (محمد معروف فتاح:١٩٩٠:١٧٦) .

٥- هۆکاری دەروونی زۆرجار دەبێتە هۆی دروستبوونی هاوواتا بۆ نموونە بۆ مردن چەند وشە و دەستەواژەیەك هەیە وەك چرای ژیانی کوژایەوە،ئەمری خوای کرد، کۆچی دوایی کرد....هتد(عبدالحمید حسن:١٩٧١:٧٢).کە هەست دەبڕینی تێدایە.

## ب- جۆرەکانی هاو واتا:

١- هاوواتای رەها:

ئەم جۆرەیان بریتیە لە پەیوەندی نێوان دوو وشە کە بتوانن جێگای یەکتر بگرنەوە بێ ئەوەی واتا سەرەکی و لاوەکیە کە بگۆرێ،بەڵام جۆن لاینز ئەم جۆرە هاوواتایە بە دەگمەن دەزانێ (نورالهدی لوشن:١٩٩٥:١٠٦) هەروەها Goodman و F.C.Stork و D.Widdowson. ئاماژە بۆ ئەوراستییە دەکەن کە وشەکان جگە لە کاریگەرییە ئاماژەییەکە کاریگەریەکی سۆزیشی هەیە،بۆیەش هاوواتای تەواو بە دوور دەزانن، جگە لەمەش ناتواندرێ شوێنی یەکتربگرنەوە بێ ئەوەی کاریگەری بەسەر واتا سەرەکییەکەی هەبێت هەرچەندە هەندێ جار دەتواندرێت دوو وشەی وەك:(mama و mother) لە هەندێ دەوروبەردا شوێنی یەکتر بگرنەوە هەروەك Lehrer ئاماژەی بۆ دەکات (عبدالقادر عبدالجلیل :٢٠٠٦:٢٧٠).

٢- هاواتای ناتەواو:

پەیوەندی نێوان دوو وشەیە کە لە سیماواتاییە هۆشەکییەکاندا لە یەك بچن ، بەڵام لە واتا لاوەکیەکان و دەربڕین و روژاندندا جیاواز بن، کە باشتر وایە بە نزیکی واتا Contiguity ناوببرێت وەك:کچ:کیژ هاواتای ناتەواون، چونکە سەرەڕای واتا هۆشەکیەکەی واتای شێوازییان جیایە و هەریەکەیان سەر بە زارێکە.

### ٢- داپۆشین ( Hyponymy ) :

داپۆشین یان گرتنەوە گرنگترین پەیوەندی واتاسازی رۆنانیە و (لاینز) پێی وایە بریتییە لەم پەیوەندییەی لە نێوان دوو وشەدا هەیە بە شێوەیەك کە واتای یەکێکیان ئەوەندە فراوانبێت کە بتوانێت واتای وشەکەی تریش بگرێتەوە (کورش صفوی؛٢٠٠٦:١٦) داپۆشین لە سەرێکەوە نزیکە لە هاوواتا، چونکە وشە گشتییەکە دەتوانێت شوێنی وشەتایبەتە کە بگرێتەوە وەك: باڵندە(کۆتر،بولبول،تاوس، ......) جا کاتێ دەڵێین:

- تاوسێکم هەیە = باڵندەیەکم هەیە

لە داپۆشیندا زاراوەیەکمان هەیە پێی دەڵێن: زاراوەی گشتی یان وشە داپۆشەر ( Cover word) و چەند زاراوەیەکی تایبەتیمان هەیە کە پێیان دەڵێن: (Subordinate) زاراوە تایبەتیەکان پۆلێك دروست دەکەن لە ناو زاراوە گشتیەکەدا (احمد مختار عمر ١٩٨٢؛:٦٦).وەك :گوڵ (مێخەك، نەسرین، مینا، دالیا،یاسەمین..) ئەم وشانە پۆلێکن لە گوڵ، جا زاراوە گشتیەکە گوڵە و جۆرەکانی ئەندامی ئەو پۆلەن.وەك:

- گوڵێکم بۆ برد.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ:گوڵە مێخەکێکەم بۆ برد،بەڵام کاتێ دەڵێین:

- گوڵە مێخەکێکم بۆ برد = گوڵێکم بۆ برد.

جا پەیوەندییەکە لە تایبەتیەوە بۆ گشتی هاوواتایە و لە گشتیەوە بۆ تایبەتی دژواتایە، وەك: گوڵێکم بۆ برد # مێخەکێکم بۆ برد، چونکە ئەندامی تری جیاواز لەوانەیە گوڵێکی تری وەك یاسەمین یا دالیای بۆ بردبێت.بەهەمان شێوە کاتێك کە نەفی دەکرێ مانای ئەوە نیە:

گوڵێکم نەکڕی = مێخەکم نەکڕی. واتە مێخەکم نەکڕی # گوڵم نەکڕی.

داپۆشین سوودی هەیە بۆ رەنگدانەوەی مێشكی مرۆڤ،چونكە هەوڵ دەدات شتی دەوروبەر كۆ بكاتەوە، لەبەر ئەوە داپۆشین پۆلینكردن دەداتە مرۆڤ ، لە پۆلی گەورەوە بۆ بچووك لە داپۆشیندا دەبێت لە بچووكەوە بۆ گەورە بێت.جون لاینز چەند كێشەیەك دەبینێ لە داپۆشیندا:

أ- تەنها زۆرجار بۆ ناو بەكار دێت بۆ كار و ئاوەڵناو، شتی تر نایەت.

ب- زۆر جار داپۆشین زاراوە گشتیەكەی تێدا نیە بۆ نموونە: (لاكێشە،بازنە، چوارلا،سێگۆشە..هتد) وشەیەك نییە دایان پۆشێت (احمد مختار عمر ١٩٨٢: ١٠٠).

ج- داپۆشین بەندە بە زانیاری قسەكەرەوە هەندێ وشە لای هەموو قسەكەرێ دەست ناكەوێت،بۆ نموونە:ئاژەڵ ، مانگا.....دەست دەكەوێ، بەڵام ( شیردەر) لای هەندێ قسەكەر دەست ناكەوێت لای بایەلۆجیەك یان خوێندەوارێ دەست دەكەوێت.ئەندامە تایبەتییەكان هەندكێجار لە نێوان خۆیاندا پێچەوانەن بۆ نموونە: دوو وشەی (كرین و فرۆشتن) زاراوەی (پەیداكردن) دایان دەپۆشێت كەچی ئەم دوو رستەیە دژواتای یەكترین وەك لەم رستانەدا دەردەكەوێت:

- ئازاد كتێبێكی لە نەوزاد كری.

- ئازاد كتێبێكی فرۆشتە نەوزاد.(عبدالله عزیز محمد:٢٠٠٥: ١٦) .

## ٢- بەش لە گشت Part-whole relation:

ئەو پەیوەندییەیە كە لە نێوان (دەست) و (لەشی مرۆڤ)دا هەیە یا لە نێوان تایە و ئۆتۆمۆبیل هەیە ،جیاوازی ئەم جۆرە پەیوەندیە لەگەڵ پەیوەندی داپۆشین ئەوەیە دەست جۆرێك نییە لە لەشی مرۆڤ،بەڵام دالیا جۆرێكە لە گوڵ.لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات ئایا بەشی بەش بەشێكە لەگشت؟ لێرەدا دوو بۆچوون سەرهەڵدەدات یەكەمیان بە بەشێك لە گشتی دادەنێت ئەویتریان بە بەش لە گشتی دانانێت. بۆ نموونە:پەیوەندی نێوان دەسك و دەرگا و ماڵ دەگوترێت

دەسك و دەرگا دەشگوترێت دەرگا و مالّ، بەلاّم ناگوترێ دەسك ومالّ جا دەتوانین بلّێین: دەرگاکە بێ دەسکە،بەلاّم ناتوانین بلّێین: مالّکە بێ دەسکە، چونکە دەگوترێ :دەسکی دەرگا (احمد مختار عمر :١٩٨٢:١٠٢).

٤- **جیاوازی** Incompatibility:

جیاوازی پەیوەستە بە بیرۆکەی نەرێ وەك دژواتا ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان ئەو وشانەدا دەبێت کە یەکتر داناپۆشن،بەلّکو دوو وشە جیاوازەکە دەبێت زاراوەیەکی گشتیان هەبێت.وەك: مانگەکانی سالّ و رۆژەکانی هەفتە و پلەکانی سەربازی و رەنگەکان و....هتد. بۆ نموونە:پەیوەندی نێوان سەگ و پشیلە پەیوەندییەکی جیاوازیە، چونکە زارەوەکی گشتییان هەیە کە ئاژەلە و دواتریش یەکتر داناپۆشن.(احمد مختار عمر:١٩٨٢:١٠٦)کەواتە مەرجی (جیاوازی) نەبوونی داپۆشینە.

جیاوازی چوار جۆرە:

أ- جیاوازی بەش لە گشتی:ئەو جیاوازیانە دەگرێتەوە کە لە نێو ئەندامەکانی بەش لەگشت دان وەك:کتاب و بەرگ،گەلاّ و دار،پەنجە و دەست......هتد.

ب- جیاوازی بازنەیی:ئەو وشە جیاوازانە دەگرێتەوە کە بەدوای یەکدا دێن و دەتوانرێت هەریەك لەوشەکان ببێتە سەرەتا یان کۆتایی وەك:رۆژەکانی هەفتە(شەممە،یەکشەممە،دووشەممە،سێ شەممە،چوارشەممە،پێنج شەممە، هەینی) یان مانگەکانی سالّ.

ج- جیاوازی پلەدار:ئەو جیاوازیانە دەگرێتەوە کە پلە پلە سەردەکەون یا دادەبەزن وەك:پلەی زانستی(مامۆستای یاریدەدەر،مامۆستا،پرۆفیسۆری یاریدەدەر،پرۆفیسۆر) یان پلەی سەربازی یان قۆناغەکانی تەمەن.

د-جیاوازی داپۆشین:ئەم جۆرە جیاوازیە دەگرێتەوە کە لە نێو ئەندامەکانی داپۆشیندایە وەك: ئەو جیاوازییەی لە نێوان(مەڕ و بزن) دا هەیە و وشەی (ئاژەڵی ماڵی) دایان دەپۆشێت (سالم سلیمان خماش:١٤٢٨:٧٠).

## ٥- دژواتا (Antonymy):

### أ- تایبەتییەکانی دژواتا:

بریتیە لەو دوو وشە جیاوازەی کە دوو واتای جیاوازیان هەیەدژواتا هەندێ تایبەتی هەیە بۆ هەموو جۆرەکانی دەبێت،دیاریدەیەکی دوو قۆڵیە، پەیوەندییەکە لە نێوان دوو شت یان دوو کەس (سالم سلیمان خماش:١٤٢٨:٦٩) بەپێچەوانەی هایپۆنیمی، هاوواتایی، ئەگەر سەیری پەیوەندی تر بکەین دەبین دوو قۆڵی نین، زۆربەی دژواتاکان بیری بەرەنگاری تیادایە و لە دوو پلە پێکدێت (سارد،گەرم) بۆ نموونە: بەرز گەرمە و نزم ساردە.

### ب- جۆرەکانی دژواتا:

١- تەواوکەری Complementary:

ئەم جۆرەی دژواتا وشەکان یەکتری تەواو دەکەن وەك:(نێر،مێ) (زیندوو،مردوو) (رەبەن،بەژن) (راست،چەوت)(پیاو،ژن).تەواکەری کێلگەیەکی واتاییمان دەداتێ، کە دەکرێ بە دوو کەرتەوە،هەر وشەکیان دەچێتە یەکێ لەم کەرتانە. واتە لە نێوانیان دا پلە نیە هەر یەکیان جەمسەرێك دەگرن، ئەوەی لەم جەمسەرە نەبێت لە جەمسەرەکەی ترە. ئەگەر یەکیان نەفی بکەین ئەوا ئەوەی تریان دەسەلمێنین، جا کاتێك کە دەڵێین: کەوەکە نێرە ئەوا ئەوەمان رەت کردۆتەوە کە کەوەکە(مێ) بێت. بەواتایەکی تر دژواتا تەواوکارەکان لەگەڵ یەکدا کۆنابنەوە.(احمد مختار عمر:١٩٨٢:١٠٢)

٢- دژواتای پلەدار Gradable :

لە پەیوەندی هەندێ وشەی وەك گەورە،بچووك دەردەکەوێ کە سیفەتن،جا ئەگەر لە رووی مەنتقەوە یەکمان نەفی کرد ئەوا ئەوی ترمان پەسەند نەکردووە (احمد مختار عمر:١٩٨٢:١٠٢).ئەم دژواتایانە رەها نین،بەڵکو رێژەیین (ه.ج.ویدۆوسن:٢٠٠٨:٩١) و پلەی جیاوازیە بەپێی پێوەرە جا کاتێ دەڵێن:

- خانووەکە گەورەیە.

مانای ئەوە نیە گەورەیە، چونکە بەراوردی شاراوە هەیە، واتە لە نێوانیان پلە هەیە دەکرێتە چەند بەشێك بۆ نموونە:گەرم، فێنك، سارد ....هتد.هەروەها دەتوانێ ئاوەڵکاری رادە وەربگرێ.وەك: زۆر گەرم.

٣- پێچەوانەیی Converseness:

لە پەیوەندی هەندێ وشەی وەك:(کڕین،فرۆشتن)(ژن،مێرد)دەردەکەوێ و هەردوو وشەکە باس لە یەك کار دەکەن و زۆر جاریش بەیەکەوەش دێن وەك:

- من کتێبەکەم لە تۆ کڕی. واتە تۆ کتێبەکەت بەمن فرۆشت.

لەم دوو رستەدا(کڕین و فرۆشتن) هەردووکیان کردەیەك دەگەیەنن، بەڵام لە دوو گۆشەی جیاواز سەیردەکرێ و هەر جارەی تیشك لە سەر هاوبەشێکە، جارێك لەسەر(من) جارێك لەسەر(تۆ) لەم جۆرەدا جۆرەها واتایەك بەدی دەکرێ (احمد مختار عمر:١٩٨٢:١٠٢) هەروەها ئەم جۆرە دژواتاییە پەیوەندییەکی بە تینی لەگەڵ جۆری (پلەدار) هەیە، چونکە هەر دژواتایەکی پلەدار وەبگرین و بیخەینە پلەی بەراورد ئەوا جۆری دژواتاکەی دەگۆڕێ بۆ دژواتای( پێچەوانە) وەك:

- دارا لە دانا کورت ترە.واتە: دانا لە دارا درێژ ترە.

جا ئەگەر خرا پلەی بەراوردی باڵا.ئەوا پەیوەندیە کە یەکانیە و نابیتە دژواتای پێچەوانە وەك: دانا درێژترین پیاوە.

٤- ئاراستەدار Directional:

ئەم جۆرەدژ واتایە لە ئاراستەکاندا دەبێت وەك:(سەر،خوار) (راست،چەپ) کە لە ئاستەدا دژ و پێچەوانەن (Sebastionlobnen:2002:88) وەك:

- کتێبەکە لەسەر مێزەکە دایە.

٥- ستوونی Paradigmatic:

ئەو دژواتایانە دەگرێتەوە کە ستوونی دەکەوێتە سەر هێلە ئاسۆییەکە وەك: (باکور - رۆژئاوا) (باشوور رۆژهەلات) (پێشەوە- دەستەڕاست)....هتد (سالم سليمان خماش :١٤٢٨: ٦٩)




٦- فرە جەمسەر Heteronyms:

ئەم وشانە دەگرێتەوە کە زیاتر لە جەمسەرێکیان هەیە وەك رۆژەکانی هەفتە و مانگەکانی ساڵ و رەنگەکان جۆرەکانی رووەك و گیانلەبەر....هتد (Sebastionlobnen:2002:91).جا ئەم جۆرە دژواتایانە لە رووی واتاسازیەوە پێی دەڵێین جیاوازی (Incomptible)،چونکە ئەگەر یەکیان رەتبکەینەوە مانای ئەوەنیە ئەویتر پەسند کراوە، چونکە کەرەسەی تری بەرامبەرە بۆ نموونە: رەنگەکان کاتێ دەڵێین:

- ئۆتۆمۆبیلەکە سپی نییە.

مانای ئەوە نیە رەنگی رەشە لەوانەیە سەوز یان سوور ....هتد بێت.

## ج- ئیدیەم ( فریزیۆلۆجی phraseology ):

### ١- ئیدییەم و جۆرەکانی:

بریتییە لەو تێکچڕژانەی کە ئاسایی دوو وشە یان زیاتر پێکهاتووە، کە واتاکەی لە واتای کەرتەکان یا پەیوەندی ڕێزمانی ئەم کەرتانە پێشبینی ناکرێن ( محمد معروف فتاح ١٩٨٦: ٦٨ ) ئیدیەم واتای فەرهەنگی وشە وەردەگریت و بۆ مەبەستێکی تری دەبات ( عبدالوهاب خالد موسى ٢٠٠٩: ٨ ) وەك: سك سوتان.

لێرەدا واتای وشەکانی(سك،سوتان) واتای (سك سوتان)مان بۆ روون ناکاتەوە، بەڵکو واتایەکی تر دەدات وەك: منداڵی مرد.هەر بۆیەش دەبێت لە ئاستی پراگماتیکدا واتاکەی لێکبدرێتەوە.

ئیدییەم واتایەکی تایبەتی بێ هاوتا دەبەخشی، زمانەوانەکان بە پێی تاریك و روونی ئیدیەم چەند پلەیەك جیادەکەنەوە وەك:

### ١- ئیدیەمی تێکچڕاو:

واتای ئەم ئیدیەمە لە ئەنجامی تواندنەوەی واتای کەرتەکانەوە دێت لەژێر کاری مێژووی خەڵك و کەلتوورەکاندایە و کەرتەکانیان شوێن ناگۆڕن و ڕێگەش بە کەرەستەی ترنادەن لەیەکیان بترازێنێت و خۆشیان پاش و پێش کەم دەکەن، کەواتە لەم ئیدیەمە پێشبینی واتا لە کەرتەکانییەوە ناکرێت.وەك: (حازر و بزر و شایی و لۆغان، چنگ لەسەر شان،.....هتد). ( محەمەد مەعروف فەتاح ١٩٨٩: ١٩٤ ).

### ٢- ئیدیەمی لێکدراو:

لە ئیدییەمی لێکدراودا تەنها یەکێك لە کەرتەکانی گۆڕانی واتایی بەسەردا دێت،واتە ئیدیەم لە وشەی بەستراودا یەکێك لە کەرتەکانی گۆڕانی واتایی بەسەردا دێت و کەرتەکەیتر واتا فەرهەنگییەکەی خۆی دەپارێزێت وەك: گۆشتی تاڵە،سەرشۆڕە،گوێی مسی تێکراوە، بۆ نموونە: وشەی (دەموچاو) کە بە واتای (روو) کە واتاکەی لە کەرتەکانییەوە جیادەبنەوە و زیاترە لە واتای دوو کەرتەکە .( محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٨٩:١٤٢)

ئیدیۆم گرنگی دەدات بە واتای کۆمەڵایەتی و بەکارهێنانی زمان دەدات،و ئیدییەم لێکسیکۆلۆجی و پراگماتیك بەیەکەوە دەبەستێتەوە،ئەو ئیدیەمانەی کە واتاکانیان لە کەرتە پێکهێنەرەکانیەوە نین وەیا لە واتا رێزمانیەوکەوە نین دواتریش ناتواندرێت وەرگێڕانێکی وشە بەوشەی بۆ بکرێت تەنها لەسنووری وشەسازیدا نەبێت،بۆ نموونە: زێڕی رەش،زمان درێژ،چاوپیس،سەرخۆر.....هتد.

### ٢- گەشەی واتایی لە ئیدییەمدا:

گۆڕنی واتایی لەخۆیەوە و بێ بەرنامە روونادات ئەگەر وابوایە کەس لە واتای نوێ نەدەگەیشت، بەڵکو بە پێی یاسایەکی لۆجیکی و دەروونی بەرێوەدەڕوات.وەك: واتا خواستن،درکە،زیادەرۆیی،توانج،پۆشین ( محەمەد مەعروف فەتاح:٢٠١٠:٢٠٤).

#### ١- خواستن:

دووشت بەیەك دەچوێندرێن ناوی یەکێکیان دەنرێت لە وانیتر و زۆر لە لێکچواندن دەچێت کە ئامرازی لێکچواندنەکەی نەمابێت ئەم لێکچواندنەش لەوانەیە لە رووی ئەرکەوە بێت وەك: سەرکار وەك چۆن سەر لەشی ئادەمیزاد بەرێوەدەبات، و

چەندین خواستنی تر وەك: سەرقاپ،قاچی مێز،دەمی كانی.لە ئیدیمیشدا نموونەی ئەم جۆرە خواستنەمان زۆرە وەك:

- وشكە پیاو: پیاوی پیسكە و رەق.
- نانی كەوتە رۆنەوە: قازانجی كرد.
- مێش میوانی نییە: بێباكە.
- نانی بڕی: لە كارەكەی دەریانكرد.

٢- درکە:

لەم جۆرە خواستنە ئەو دوو شتەی ناودەگۆڕنەوە زۆر نزیكن لەیەكتری كە لەوانەیە پەیوەندی شوێن یا كات یا ئەرك بێت لەوانەشە یەكێك لە شتەكان نیشانەی ئەویتریان بێت وەك: (شارەكە خرۆشا) لێرەدا مەبەست خەڵكی شارەكەیە،لە ئیدیەمدا نموونەی ئەمەمان زۆرە وەك:

- لێوی لێ نەداوە: نەی خواردووە
- ورگی سەرناوە: قەڵەوبووە

٣- زیادەڕۆیی:

كە واتاكەی لەگەڵ واقیع یەكناگرتەوە وەك:

- موو بە بەینیان وەناچێت: زۆر نزیكن.
- هەژدەهەژدە قسەدەكات: زۆر زۆر قسەدەكات.
- هەزار تەڵەی بە كلك تەقاندووە.

٤- تەوس:

ئەو دەربڕینانەدەگرێتەوە كە بە توانج گوتراوە واتە راست نییە وەك:

- پاشەڵ جوان.

- دەست بخە دەمی بزانە دەیگەزێت.
- دەستی خێری نایەسەر.

٥- **پۆشین:**

زۆر دیاردە هەیە پەیوەندی بە جنس و نەخۆشییەوە هەیە و دەپۆشرێت و بەزەقی ناگوترێت وەك:

- دەستیان لێوەشاندووە: شێت بووە.
- دەستیان تێکەڵکردووە: حەزیان لەیەکتر کردووە.
- بازاری گەرمە : بۆ کچ بەکاردێت
- دووگیانە: ئافرەتەکە سك پڕە (محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٨٩: ٢٠٠ تا ٢٠٤)

## بەشی دووەم: پەرەسەندنی فۆرم و واتای وشە :

### ١- ڕێگاکانی ڕۆنانی لێکسیك:

وشە لە زماندا هەر بە سادەیی نامێنێتەوە، بەڵکو وشە سادەکە لە ڕێگای چەند کردەیەك گەشەو گۆڕانی بەسەردا دێت لە ڕووی فۆرمەوە بەم پێیەش کاریگەری دەبێت لەسەر گۆڕانی واتا،ڕێگاکانیش بریتین لە :

**أ- دارشتن:**

**١- دارشتنی ناو :**

کە لە شێوەی پێشگر و پاشگر بەرچاودەکەون و بەشداری لە دارشتنی وشەدا دەکەن وەك: هونەر+ مەند = هونەرمەند.

أ– پێشگرەکان:

– نا+ پاك : ناپاك

– پێ ویست.

– رایەخ.

– بەرچنە،بەرکوت

– هاورێ،هاوژین

ب– پاشگرەکان:

وەك:(دار ـ بەند ـ وان ـ ەوان ـ گەر ـ ساز ـ چی ـ کەر ـ مەند ـ زار ـ ێن ـ نیە ـ ێنە ـ ەڵان ـ ار ـ ەر ـ یار ـ مان ـ ندە ـ گەرك ـ کە ـ ەمەنی ـ ەوە ـ ەوا).

ـ دار : بریندار

ـ وان : کاروان

– ەوان: ئاشەوان.

– گەر: ئاسنگەر.

- ساز: ددانساز.
- چی: کەبابچی.
- مەند: هونەمەند.
- کەر: کارەکەر.
- ێن: پشتێن.
- ینە: دۆینە
- ێنە: زەردێنە
- ەوا: نانەوا
- زار : گوڵزار) (ئەسرین فەخری و کوردستان موکریانی: ١٩٨٧ :١٣-١٤)

ئەم پاشگرانەش (ی - ەتی - ێتی - ایەتی) دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی گوزارەیی پێکدێنن وە واتای ئەبستراکت دەبەخشن،وەك:

- ی ، جوانی
- ەتی ، برایەتی
- یەتی ، دۆستایەتی

پاشگری (گە - گا - خانە - ستان - دان - ەوان) دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی لێ پێکدێنن، وە بە شێوەیەکی گشتی شوێن و جێگە پیشان دەدەن:٠

- گە ، کارگە
- گا ، دادگا
- ستان ، کوردستان
- دان ، ئاگردان
- ەوار ، شێنەوار

پاشگری (له ، ۆڵه ، ورله ، وگه ، یله ، ۆکه ، چه ، چکه ، ولکه ، یلکه ، ۆڵ ، ەل ، وو ، وك ، و) بەشێوەیەکی گشتی بۆ بچووك کرنـەوە بـەکاردێت لـە دانەیـەکیان هێندێکیان واتای بکەریش دەبەخشن وەك:

– له : مێروله

– ڵه : گۆزەڵه

– ۆڵه : کیژۆڵه

– ۆ : کوردۆ

ئەم پاشگرانەی لای خوارەوەش دەچنە سەر ناوەڵناوی سادە و (نـاوی دارێـژراو) ی لێ دروست دەکرێت و هەندێ لەو پاشگرانە ناوی دارێژراوی گوزارەیی دادەرێـژن وەك:

– ی : جوانی،ئازادی

– ە : سەوزە

– ەتی: ئازایەتی (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی :٢٠٠٠؛ ٣٢).

**٢- دارشتنی ناوەڵناو:**

**أ- پێشگرەکان:**

– بێ: بێهۆش.

– بە: بەهێز.

– نە: نەخۆش.نەزان

– نا: نارێك.

**ب- پاشگرەکان:**

– ی: جیهانی.

– ن: ورگن.

- ین: بەفرین.
- وەر: بەختەوەر.
- دار: ئاگادار.
- ێ: کرمێ.
- انە: منداڵانە.
- ەکی: دەشتەکی.
- انی: ژنانی.
- ناک: غەمناک.
- ە: هاوینە.
- وور: رەنجوور.
- اوی: شاخاوی.
- دار: ناودار.
- باز: فێڵباز.
- انی: نەرمانی.
- ۆ: پیسۆ.
- ۆکە: پیسۆکە.
- ەڵە: نەرمەڵە.
- کەلە: سورکەڵە.
- یلکە:سپیلکە.
- ۆلکە: بەرزۆڵکە.
- اک: رۆناک.
- ۆک: لەرزۆک.

- ەک: نووسەک.
- ار: دیار.
- ا: زانا.
- وو: مردوو.
- ین: بەرین. (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧: ٦٥ تا ٧٢)

**٣- دارشتنی ئاوەڵکار:**

**أ- پێشگر:**

- بێ: بێگومان.
- بە: بەگوڕ.

**ب- پاشگر:**

- ێ: شەوێ.
- انە: ژیرانە.
- ئاسایی: شێر ئاسایی.
- ەکی: شەوەکی.

**٤- دارشتنی کار:**

کار لە زمانی کوردیدا بە دوو شێوە دادەڕێژرێت:

**أ- پێشگر:**

- دا: دابەزین.
- را: راگرتن.
- هەڵ: هەڵچوون.
- رۆ: رۆچوون.
- وەر: وەرگێران.
- رێ: رێکخستن.

- پیَ: پیَکەنین.
- تیَ: تیَگەیشتن.
- لیَ: لیَدان.

**ب- پاشگر:**

- ەوە: کردنەوە.
- اندن: سوتاندن.(**ئەورەحمانی حاجی مارف؛١٩٨٧: ٨١**)

**ب- داتاشین:**

ئەم جۆرە ریَبازە بۆ دروستکردنی وشە لە ریَگای لیَکدانەوە دەبیَت، بەلاَم لە ئەنجامی لیَکدان هەندیَ دەنگ دەسویَ یان گۆڕانکاری بەسەردادیَت وەك:

- ماست+ ئاو = ماستاو (دەنگی ئـ) سواوە.
- گا+ ئاسن = گاسن (دەنگی ئـ) سواوە.
- دەست+گیران= دەزگیران (دەنگی ت سواوە و دەنگی (س) گۆڕاوە بۆ (ز).

**ج- لیَکدان:**

لیَکدان ریَگایەکە بۆ دروستبوونی وشە و زاراوە کە لە ئەنجامی لیَکدانی دوو وشە وشەیەکی نویَ دیَتە کایەوە، ئەم لیَکدانەش بە دوو شیَوە ئەنجام دەدریَت هەندیَکیان بە مۆرفیمی لیَکدەر ئەوانی تر بەبیَ ئامرازی لیَکدەر ئەنجام دەدریَت وەك :

**١- ناوی لیَکدراو:**

- دەستنویَژ.
- رەشماڵ
- شاهەنگ

- مارماسی
- بەفراو

ئەوەکەی تر بە هەندێ ئامرازی لێکدەر لێکدەدرێت وەك: (ە،و،ەو،او ،ان، بە...هتد) وەك :

- گوڵەباخ
- بانەوبان
- رەنگاورەنگ.
- بەرانبەر (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٤١)
- لەرزوتا
- سەر بە گۆبەند. (کامل حەسەن بەصیر: ١٩٧٩:٦٢).

٢- ئاوەڵناوی لێکدراو:

- گەردەن بلوور
- سەرگەرم
- سەرشکاو
- خۆشباوەر
- لێو بە بار.
- گورج و گۆڵ
- دوودڵ

٣- ئاوڵکاری لێکدراو:

ئاوەڵکاری لێکدراو پێکدێت لە دووبارەبوونەوەی فۆرمێك وەك: ناو ئاوەڵناو، ئاوەڵکار ....وەك:

- پۆل پۆل
- دوو دوو

- کەم کەم

هەندێ جا ئەم دووبارە بوونەوانە بە یارمەتی مۆرفیمی لێکدەر دەبێت وەك:

- پشتاوپشت.
- بانەوبان
- پربەدڵ (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٩٥)

**٤- کاری لێکدراو:**

بە یارمەتی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکار دروست دەبێت:

- دەست برین
- سەرشکاندن
- ڕێگاگرتن
- ماستاوکردن
- بڵندکردن.
- نەخۆشکەوتن.
- بەخێوکردن
- تێربوون.
- بڕیاردان. (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٩٤)

زۆرجار بە کەرستەی خوازراو بەتایبەت زمانی عەرەبی کاری لێکدراو دروستدەکرێت وەك:

- ناو + کار = زەکاتی دا ، حەفلە دەکەن،ئیفلاسیکرد.
- ئاوەڵناو+ کار = رازیدەکەن،قانیع دەبم،مرەخەس دەبم.(محەمەد مەعروف فەتاح ١٩٩٠: ١٤٢).

**د- ئاوەڵ واتا:**

لە زمانی کوردیدا دەتواندرێت دوو جۆرە واتا جیابکرێتەوە :

١- دروست: بەو واتایە دەگوترێت، کە راستەوخۆ واتا فەرهەنگییەکەی دەدات.

٢- خوازە: بەو واتایە دەگوترێت کە کە راستەخۆ واتاکە نیشان نادات، بەڵکو لەرێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاریدەکەی واتا دەدات. بۆ نموونە وشەی (ئاگرنانەوە) دوو واتی هەیە (ئاگرتێبەردان) و (ئاژاوە نانەوە) واتای یەکەم واتایەکی درووستە و واتای دووەم واتایەکی خوازەیە.

**ه- زرەرێژ:**

لە وشەی زمانی کوردیدا زۆر وشە بەرچاو دەکەون کە لە رێگای زرەرێژەوە دوروست بوینە و لەوانەیە کەسێکی نەشارەزا بە وشەیەکی کوردی بێتە بەر چاو. زرەرێژ بریتییە لە وشانەی کە لەزمانی زمانی بێگانەوە چۆن دورست بوە و دارێژراوە بە هەمان شێوەش لە زمانی کوریدا دورست بووە و دارێژراوە. بۆ نموونە وشەیەکی وەك (Proanoun) و (جێناو) کە وەرگردراوێکی زمانی ئینگلیزییە و لە دوو مۆرفیمی جیا پێکهاتووە (PRO) واتە (جێ) و(NOUN) واتە (ناو). هەروەها وشەیەکی وەك: (شرق شناس یان شرق خاوەر) کە وەرگێردراوە بۆ (رۆژهەلات ناس) ئەمیش لە زمانی فارسی دا لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە (شرق-خاوەر) واتە (رۆژهەلات) و (شناس) واتە (ناس).بەم جۆرە دەبینین ئەم وشە زرەرێژانە لە کەرەسەی زمانی کوردیدا دورستکراون، بەلآم شێوەی پێکهاتنیان تیشکدانەوەی وشەی بێگانەیان پێوە دیارە.

**و- وەرگێران:**

بێگومان بەشێکی وشەی هەر زمانێك لە ڕێگای وەرگێڕانەوە دێتە کایەوە، لە ڕێبازی وەرگێراندا واتای فەرهەنگی تاکە وشەیەکی زمانە بێگانەکە وەردەگیرێت وەك:

- اخراج : دەرهێنان
- تمثیل: نواندن.
- اجتماع: کۆبۆنەوە
- البنیە التحتیە: ژێخان.
- المظاهرة: خۆپیشاندان.

**ز- وەرگرتن:**

هەموو زمانەکانی جیهان وشە دێتە ناو زمانەکەیانەوە لە ئەنجامی هۆکاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی سروشت و تایبەتی هەر زمانێك جیایە لەویتر بۆیە ئەو زمانەی کەوەری دەگرێت دەیخاتە ژێر کاریگەری فۆنۆلۆجی خۆی بۆ نموونە وشەی (قوتابی) لە (الکتتاب) ی عەرەبیەوە وەرگیراوە و بە سێ قۆناغ ڕۆیشتووە:

١- دەنگی (ك) گۆڕاوە بۆ (ق).

٢- لە دوو (ت) یەکیان فرێدراوە.

٣- واتای کتتابی عەرەبی لە (شاگرد) ی حوجرە بۆ فێرخوازی فێرگە و زانکۆ گۆڕاوە.

- حق: دەنگی (ح) گۆڕاوە بۆ (ه).
- الکتاب: کتێب دەنگی (ێ) زیاد بووە.
- بحث: باس (ا) زیاد بووە و (پ) گۆڕاوە بۆ (س).

- مرؤة: مروەت (ء) سواوە (ة) گۆڕاوە بۆ (ت)
- ذلیل: زەلیل دەنگی (ذ) گۆڕاوە بۆ (ز) و لە بری فەتحە (ە) دانراوە.
- مقص: مقەس دەنگی (ص) گۆڕاوە بۆ (س) لە بری فەتحە (ە) دانراوە.
- وجدان: ویژدان (دەنگی ج بۆتە ژ) . (كامل حەسەن بەصیر: ١٩٧٩:٤٤ تا ٤٦)

**ح- كرتاندن و لێكدانەوە:**

بۆ نموونە داتاشینی وشەی (زانكۆ) دا كە پێكهاتووە لە كۆكردنـەوەی ڕەگـی (زانین) كـە (زان) لەگـەڵ لێكـدانی (كۆكردنـەوە) و كرتانـدنی (كردنـەوە) دروسـت بووە.هەروەها ئەم ڕێگایە لە وشەی (كۆ زمانەوانی) یش بەرچاو دەكەوێت.

**گ- ئەكرۆنیم :**

ئەكرۆنیم بریتییە لـە برگـەی یەكـەمی یـان دەنگـی یەكـەمی دوو وشـە یـا زیـاتر و خوێندنەوەیان بەیەكەوە یـان وەك دەنگـی پیتـەكان بـۆ نموونـە (د.خ) بـۆ درودی خوای لەسەر بێت.(پ.ز) پێش زاین ( محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٩٠:١٢٢).

**٢- پەرەسەندنی واتای لێكسیك:**

ئەم وشانەی كە ئێستا لە زماندا دەیانبین بەم جۆرەی ئێستا نـەبووە و بەچـەند قۆناغێكدا ڕۆیشتووە لەدایكبوون و پەرەسەندن پەیوەندی دوور و نزیكی بە بنجـی وشــەكەوە و بڵاوبونــەوە تــاكو مردنــی وشــە،كەواتە وشــە لەســەر بنــەمای بەكارهێنانەوە بە درێـژایی مێـژوو وشـە ئـاڵوگۆڕی بەسـەردادێت لـە ڕووی فـۆرم و واتاوە.بۆ ئەم مەبەستەش سێ وشەی وەك: (دەست، دڵ،چاو) وەردەگرین و ئـەو گۆڕانكاریانە دەخەینەروو كە بەسەریاندا هاتووە لە ڕووی فۆرم و واتاوە.

**A- دەست:**

**أ- (دەست) لە وشەی سادە:**

ئەم وشەیە هەروەك دەبینین وشەیەکی سادەیە و واتاکەشی ئەندامێکی لەشی مرۆڤە.

**ب- دەست لە وشەی دارێژراودا:**

١- دەستە: کە وشەیەکی دارێژراوە و چەند واتایەکی هەیە وەك:

- دەستەیەك قەڵەم (واتای ژمارە دوانزە) دەگەیەنێت.

- دەستە جلێکم بۆ بکرە. واتای ( قاتێك) دەگەیەنێت.

٢- دەسك : لێرەدا (ت) کرتاوە و دەستی شت دەگەیەنێت نەك دەستی مرۆڤ هەر بۆ جیاکردنەوەش کرتاوە وەك:

- دەسکی دەرگاکە شکا.

٣- دەسکە: کە پێکهاتووە لە (دەست+ەکە) لێرەدا (ت) کرتاوە بۆتە (دەسکە) کە واتای (چەپکێك) دەگەیەنێت کە دیسان واتای ژمارە دەدات وەك :

- دەسکی گوڵم برد بۆ هاورێکەم .

٤- دەزگا: کە پێکهاتووە لە (دەست+گا) بەڵام (ت) کرتاوە و (س) گۆڕاوە بۆ (ز) و بۆتە (دەزگا) کە واتای شوێن دەدات چونکە (گا) پاشگرە و شوێن دروست دەکات.وەك:

- کتێبەکەم لە دەزگای موکریان چاپکراوە.

٥- دەسرۆکە: پێکهاتووە لە دەست+ر+ ۆکە کە (ت) سواوە واتای دەسماڵ دەدات.

٦- دەسکەوان: پێکهاتووە لە دەسك+ەوان کە (وان) واتای خاوەنیەتی دەگەیەنێت و لە ئاسن و دار دروست دەکرێت و شتی تیادە دەکوترێت.

٧- دەستوور: پێکهاتووە لە (دەست+ وور) کە ت(وور) پاشگرێکی ناوییە و واتای یاسا دەگەیەنێت.

٨- دەسرازە: پێکهاتووە لە (دەست+رازە) کە لە بێشکەدا منالّی پێدەپێچرێتەوە و لەوانەیە (دەست رازاوە) بێت و سوابێت بۆ (دەسترازە)، چونکە بەدەست دروستدەکرێت و دەڕازندرێتەوە.

**ج- دەست لە وشەی لێکدراودا:**

١- دەسمالّ: پێکهاتووە لە (دەست+مالّ) و (ت) سواوە ئەو پارچە جلەیە کە ئافرەت بەسەر شانیەوە دەدات.

٢- دەستەسڕ: پێکهاتووە لە (دەست+ە+ سڕ (ڕەگی سڕین)) کە پارچە قوماشێکە بۆ دەستسڕین بەکاردەهات.

٣- دەزگیران: پێکهاتووە لە (دەست+گیران) کە قۆناغی دوای شەکراو خواردنەوە دەگەیەنێت واتە پێش گواستنەوە.

٤- دەست نووس: پێکهاتووە لە (دەست+ نووس (ڕەگی نووسین)) ئەو نوسینانە دەگرێتەوە کە بە دەست نووسراوە.

٥- دەستەمۆ: پێکهاتووە لە (دەست+مۆ) واتای مالّیکردن دەدات بۆ ئاژەلّ بەکاردێت.وشەی (مۆ) گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە.

٦- دەسخەڕۆ: پێکهاتووە لە ( دەست+ خەڕۆ) واتای فێلّباز و دەستبڕین دەدات.

٧- دەسنوێژ: پێکهاتووە لە (دەست+ نوێژ) کە (ت) سواوە و ئامادەیی بۆ نوێژکردن دەگەیەنێت.

٨- دەستە خوشك: پێکهاتووە لە (دەست+خوشك) واتە هاوڕێی کچ دەگەیەنێت.

٩- دەستاڕ: پێکهاتووە لە (دەست+ هاڕ (ڕەگی هاڕین)) کە لەبەر دروستدەکرا بۆ هارینی گەنم و ساوار....هتد و بەدەستی دەیان سوڕاند.

١٠- دەستبار: پێکهاتووە لە (دەست+بار) واتە دەست بە بارەوەگرتن.

١١- دەسکەوت: پێکهاتوە لە (دەست + کەوت) کە واتای قازانج دەدات.

١٢- دەستپێکردن: پێکهاتووە لە (دەست+ پێکردن) واتای دەست هەڵدان دێت.

١٣- دەستگرتن: پێکهاتووە لە (دەست+گرتن) کە واتای هاریکاری و یارمەتی دەدات.

١٤- دەستبەسەر: پێکهاتووە لە (دەست+ بە+سەر) کە واتای ژێر چاودێری و دیلی دەگەیەنێت.

١٥- دەستەبەرە: (دەست+بەرە) بۆ ئەو شتە بەکاردێت کە بە دەست دەبردرێت یان بەدەست هەڵدەگیرێت.

١٦- ئاودەست: پێکهاتووە لە (ئاو+ دەست) کە شوێنی دەست بە ئاو گەیاندنە.

١٧- دەستکرد: پێکهاتووە لە (دەست+ کرد (رەگی کردن)) کە بە شتێك دەوترێت کە بەدەستکرابێت.

١٨- دەسمایە: پێکهاتووە لە (دەست+مایە) ئەوەی لە دەست دەمێنێتەوە واتە سەرمایە یان قازانج.

**د- دەست لە جووتە وشەدا:**

١- دەستەدەستە: واتە کۆمەڵ کۆمەڵ

٢- دەست و برد. واتە یەکسەر و خێرا.

٣- دەست و دەم: واتە دەست و برد (دەم) لێرە کاتە.

٤- دەستاودەست: واتە دەست و برد یان شتێك کە ئەم دەست و ئەودەستی کردبێت.

٥- دەست و بازوو: واتە دەست و بازوو یان دەست و مەچەك.

٦- دەست و پل: واتە دەست و پەنجە.

٧- دەستە و دایەرە: واتە کەس و شوێن.

٨- دەستە و دامان: واتای دەخالەت دەدات.

٩- دەست و وسان: واتە بێ دەسەڵات و کەم توانا.

١٠- دامودەزگا: واتە فەرمانگە یان شوێنی تر.

١١- دەست و پێوەند: واتە بەردەست،ئیشکەر، کارەکەر.

**٥- دەست ئیدیەمدا:**

١- دەستپاک: واتە ئەمین

٢- دەستپیس: واتە دز

٣- دەستدرێژ: واتە کەسی خاوەن سامان و دەوڵەمەند.

٤- دەستکورد: واتە هەژار.

٥- بە دەسەڵات: واتە دەست ڕۆیشتوو.

٦- بێ دەسەڵات: واتە دەستکورت و بێ توانا.

٧- دەستەڕۆ: واتە دەست ڕۆیشتوو.

٨- دەستبڕ: واتە فێڵباز و دز.

٩- دەستبڵاو: واتە دەست بە ماڵی خۆیەوە ناگرێت.

١٠- دەستباد: واتە لات و بێکەڵك و پارە و پولی لە دەست ناوەستێت

١١- ژێر دەستە: واتە دەستوپێوەند.

١٢- دەست سپی:

١٣- دەست ڕەش:

١٤- دەست رەنگین:

١٥- سەردەستە:

١٦- دەستەپاچە:

١٧- دەستەونەژنۆ:

١٨- بەدەستی خەڵك مار دەگرێ:

١٩- دەستیان لێوەشاندوە:

٢٠ دەست بۆ ئاڵتوون دەبات دەبێتە خۆڵ:

٢١- سەرت دەتاشی و ئاوێنەشت دەداتە دەست.

٢٢- دەست بەدەمی سەگا دەکات:

٢٣- دەستی نەمەییوە:

٢٤- دەستی ئەوی تێدایە:

٢٥- دەست بەستەیە:

٢٦- دەستنیشانی کردووە:

٢٧- دەست لە بەرۆکی ناکاتەوە:

٢٨- دەستە و ئەژنۆ دانیشتووە:

٢٩- دەستی لێ شوشتووە:

٣٠- دەست و قەڵەمی هەیە:

٣١- بۆی دەست نادات:

٣٢- دەستی خستۆتەسەر دەست:

٣٣- دەست لێبەردان:

٣٤- دەستی گۆج بووە:

٣٥- دەست بەسەرە:

٣٦- هیچی لەدەست نابێتەوە:

٣٧- دەسی لێ هەڵگرتووە:

٣٨- دەستی بەسەردا کێشاوە:

٣٩- بەدەستی ئەنقەست:

٤٠- پەرێشانە بە دەستییەوە:

٤١- خەریکە دەستە چەورەکەی بەسەری منا دەسوێت.

٤٢- شەیتان دەستی لێشتووە:

٤٣- دەستی پێکردەوە:

٤٤- هەر دەستی دەگەزێ:

٤٥- دەستی بەسەرداگرتووە:

**و- دەست لە پەندی پێشیناندا:**

١- سەرێك بە دەستی خۆت نەیخورێنی خورشتی ناشکێت.

٢- دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

٣- ئەوەی بە پەیژەدا سەرکەوێت دەبێت لە خوارەوە دەست پێبکات.

٤- فێری رۆیشتن بە ئینجا دەستبکە بە ڕاکردن.

٥- شین و شایی دەستەوایی.

٦- مرۆڤ کە چووە شاری کوێران دەبێت دەست بە چاوی خۆیەوە بگرێت.

٧- گرێی دەستان مەخە ددانان.

٨- چەپڵە بە دەستێك لێنادرێت.

٩- دەستێك نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم:

١٠- دەستی بە کڵاوی خۆی گرووە تا با نەیبات.

١١- دوو گندۆرە بە دەستێك هەڵناگیرێت.

١٢- دروونە لە بەری دەست ناکرێت.

١٣- دەست بۆ هەموو کەس درێژ مەکە.

١٤- دەست دەست دەناسێت.

١٥- هەتا لەسەر دەست نەڕۆی قەدری پێ نازانی.

١٦- دەستێکی پێوەنێ:

١٧- دەستێك بێنە بەخۆتا:

١٨- دەستێکم کەوتە ئەودیو دەستەکەی ترم کەوتە ئەو دیو:

١٩- دەستی لێمەدە:

٢٠- بەدەست من نییە:

٢١- دەستم بە هەویرە هەر ئەوەندەم لەبیرە:

٢٢- زماندرێژی دەستکورتە:

٢٣- نایە دەستییەوە:

٢٤- شتێکی وام بە دەستەوەیە:

٢٥- هەر لە دەست و پەنجەی خۆی دێت (نەسرین فەخری:١٩٨٤: ٥٢ تا ٦١).

B- دڵ:

**أ- دڵ لە وشەی سادەدا:**

- دڵ: ئەندامێکی لەشی مرۆڤە و خوێن دەگوازێتەوە و دابەشی دەکات بە هەموو لەشی مرۆڤ.

**ب- دڵ لە وشەی دارێژراودا:**

- دڵدار: پێکهاتوو لە (دڵ+ دار) : خۆشەویستی (دار) خاوەنییەتی دەگەیەنێت.

- دڵداری: خۆشەویستی.

- دلاوەر: دلرفێن.

- دلۆڤان: دۆست،خۆشەویست.

**ج- دڵ لە وشەی لێکدراودا:**

- دڵزار: پێکهاتووە لە (دڵ+ ئازار) واتە: غەمگین

- دلبەر: دڵبردن

- دڵنیا: ئاسوودە.

- دڵشاد: بەکەیف.

- دڵخواز: چۆتە دڵ.

– دڵئارام: سەبر
– دڵارا: دڵگیر.

**د- دڵ لە ئیدیەمدا:**

– دڵپاك: رق و کینەی لە دڵدانییە.
– دڵپیس: بەگومان.
– دڵنەرم: بەبەزەیی.
– دڵ رەق: دڵ قایم.
– دڵناسك: هەست ناسك.
– دڵگیر: دوو واتای دژی هەیە: غەمگین، دلفرێن.
– دڵ تەنگ: غەمگین.
– دڵ خۆش: کەیفخۆش.
– دڵبەند: دڵ پێوەبوون.
– دڵ تەڕ: کەیفخۆش.
– دڵپڕ: دڵپڕبوون لە قین و داخ و خواردن.
– دوو دڵ: بە گومان.
– دڵ سارد: بەدڵ نەبوون.
– دڵ گەرم: دژی دڵ ساردە.
– دڵ ڕەش: دڵپیس،دڵ رەق.
– دڵڕوون: دڵخۆش.
– دڵگران: دڵفراوان.
– دڵڕاگرتن: دڵنەشکاندن.
– دڵبردن: تێکچوونی دڵ.
– دڵمردوو: حەز لە شتی جوان ناکات: خەمۆك.

- دڵڕەنجاو: دڵشکاو.
- دڵە لەرزێ: دڵە کوتە.
- دڵ تێکەڵهاتن: دڵ تێکچوون بەهۆی خواردن و خواردنەوە.
- دڵخاوبوونەوە: سستبوون.
- دڵپێداچوون: دڵپێوەبوون: چوونە دڵ.
- دڵ بەخۆ سووتان: دڵ لە خۆدامان: بەزەیی بەخۆ هاتنەوە.
- دڵ لەخۆچوون: بێ هۆشبوون.
- دڵ ئازاردان: دڵڕەنجاندن،دڵشکاندن،دڵبریندارکردن....
- دڵکرمن: دڵپیس.
- دڵە ڕاوکێ: دوودڵی.
- دڵێدان: ئارەزووکردن بۆ شتێك.
- دڵکرانەوە: دڵخۆشبوون.
- دڵسووتان: بەزەیی هاتنەوە.
- دڵسوتاو: جگەر سوتاو.
- دڵشکاو: دڵڕەنجاو.
- دڵ ئاوخواردنەوە: دڵنیابوون.
- دڵخۆشبوون: شادمانبوون.
- دڵ دانەوە: دڵخۆشیکردن.
- دڵ وەستان: دڵ لە کار کەوتن.
- دڵ کەوتنە خوارەوە: خورپەی دڵ.
- دڵە تەپێ: دڵە خورپە.(نەسرین فەخری:١٩٨٥: ١٨٠ تا ١٨٤).

**ه- دڵ لە پەندی پێشیناندا :**

- دڵ ئاوێنەی دڵە.

- سەرکزی دڵ وریا:

- دڵ شوشەیە کە شکا چاگ نابێتەوە.

**C- چاو:**

**أ- چاو لە وشەی سادەدا :**

- چاو: دیدە

**ب- چاو لە وشەی دارێژراودا :**

- چاویلکە: عەینەك

**ج- چاو لە وشەی لێکدراودا :**

- سەرچاوە : کانگە

- ناوچەوان: نێوان دوو چاوان

- چاوەروان: ئینتیزار.

- چاوزار: ناوی دوعایەکە بۆ خۆپارستن لە چاوی حەسوود لە مل دەکرێت.

- چاوێر: سەرپەرشتکەر.

**د- چاو لە جووتە وشەدا :**

- دەموچاو: روخسار.

- چروچاو: روخسار بۆ رق و کینە بەکاردێت.

**ه- چاو لە چاوگی لێکدراودا :**

- چاونوقاندن: چاوقوچاندن.

- چاولێکنان: نوستن یان مردن.

- چاولێخشاندن: سەرپێی سەیرکردن.

**و- چاو لە ئیدیەمدا:**

- چاوپیس: حەسوود
- چاوتیژ: وردبین.
- چاوکز: کەم بین.
- چاوبرسی: چاوچنۆک.
- چاوتێر: دەست بڵاو
- چاوحیز: چاوشۆڕ.
- چاوباز: چاولەدەر
- چاوقایم: بێ چاوڕوو
- چاومار: چاوجوان.
- چاوکراوە: شارەزا و زیرەك.
- چاولێداگرتن: قسەکردن بەچاو.
- چاولێپۆشین: لێبووردن.
- چاهەڵتەکاندن: چاوباز.
- چاوچاوی نابینێت: تاریك.
- بە تیلی چاو سەیریکرد.
- چاوی لێ مۆڕکردەوە: بەتوورەیی سەیریکرد.
- چاوی پەریوەتە تەوقی سەری: زۆر تووڕەیە.
- کل لە چاو دەدزێت: دزێکی بێ هاوتایە.
- بەچاوەوەبووە: چاوی حەسوود لێیداوە.
- چاوی تێبریووە: بەتەمای ئەو کەسەیە.
- چاوی کولە: چاوی نەخۆشە.
- چاوی تاریکبووە: کزبووە.

- چاوی لێسوورکردەوە: لێی توورەبوو.
- چاو لە دەر: سەیری ئافرەتی تر دەکات.
- ئاگر لە چاوی دەباری: توورەیە.
- چاو بە چاو دەکەوێتەوە: دواتر هەرکارتان بەیەک دەبێت.
- هیچی لەبەر چاو نییە: بێ وەفایە.
- چاوی عەرز نابینێت: توورەیە.
- لەبەر چاوم کەوت: خۆشەویستی جارانی نەما.
- بەرچاوی تەنگە: رەزیلە.
- دەچیتە ناو چاوەوە: رووی قایمە.
- پەنجە دەکات بە چاوتا: رووقایمە.
- چاوی چووە بە قولاّ: زۆر زەعیفە.
- چاوی کوێرە لە عاستی ئێمە: بێ وەفایە.
- چاوی لە خوێنا سوورە: شەرانییە.
- چاوی ئەبلّەق بوو: بووراوەتەوە یان ماندووە.
- خوێن بەرچاوی گرتووە: زۆر توورە و پەستە.
- بەرچاوی تەنگە: رەزیلە.
- چاوی رێشکە و پێشکە دەکات: چاوی کەم حوکم بووە.
- ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە: لە بنچینەدا باش نییە.
- چەمی درۆ سەرچاوەی نزیکە: درۆ زوو ئاشکرا دەبێت.
- چویتە شاری کوێران دەست بەچاوی خۆتەوە بگرە: واتە ئارەزووی دەوروبەرەکەت هەڵسوکەوت بکە. (نەسرین فەخری:١٩٨٤: ٢٩ تا ٣٦)

## بەشی سێیەم: گۆڕانی واتای وشە

### ١- سەرەتا:

گەشەو گۆرانی واتا پەیوەندی بە سیمالۆجی Semasiology و واتاسازی مێژووییەوە Historical semantics کە سەرتا لای ئەڵمانەکان لە ١٨٠٠ز دەستی پێکرد و دواتر گواستراوە بۆ زانایە کۆمەڵناسە فەرەنسییەکان (عبدالقادر عبدالجليل ٢٠٠٦: ٣٢٧) لەم سەردەمەوە هەوڵدرا لە گۆرانی واتای وشەکان بکۆڵدرێتەوە و لەسەر بنچینەیەکی لۆجیکی پۆلێنیان بکەین، چونکە گرنگترین دیاردە کەزمانەوانەکانی سەرقاڵ کردبوو گۆرانی واتا و هۆکارەکان و ئەو بنەمایانە بوون کە باس لە هاتنەکایە و مردنی وشە دەکەن.(cohen) کۆهێن لە کتابەکەی ( The diversty of meaning) دەپرسێ ئایا واتا دەگۆرێ ؟ بۆ ئەمە وەڵام دەداتەوە ودەڵێت:هەمان ووشە لەبەر گۆرانی زمان بەپێ کات مانایەکی تر وەردەگرێ و بیرێکی تر روون دەکاتەوە جا بۆیە مەبەستمان لەگۆرانی واتا گۆرانی واتای ووشەکانە (احمد مختار عمر ١٩٨٢: ٢٣٥) .

ئاشکرایە کە زمان دیاریدەیەکی کۆمەڵایەتییە لەباوەشی کۆمەڵگا دەژی و هەر پێشکەوتنێك لە کۆمەڵگا روویدات لەزمانیش رەنگدەداتەوە(رمضان عبدالتواب ١٩٨٢: ٥) باشترین بەڵگەش لەزمانی کوردیدا گۆڕانی زمانە لەدوای ڕاپەرین.ئەم گۆڕانەش بێ ئارەزووە و لە توانای کەسدانیە رای بگرێت و هەموو ئاستەکانی زمان لە دەنگ و وشە و ڕستە و واتا دەگرێتەوە،(ستيفن اولمان:١٩٧٥: ١٥٦) ئاشکرایە کە گرنگترین گۆڕان لە ئاستی واتادا دەبێت، لەم بارەیەوە ئۆڵمان دەڵێت: واتا بریتیە لەو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕەی کە لە نێوان ووشە وماناکەیدا هەیە بەم پێیە هەر گۆڕانێك لەو پەیوەندیەدا روویدات ئەوا بە گۆڕانی واتایی لە قەڵەم دەدرێ (ستيفن اولمان: ١٩٨٦: ١٦٩).گۆڕان لە واتا بە دوو شێوە دەبێت: کاتێ کە واتایەکی نوێ بە وشەیەکی

کۆن دەدرێ، کاتێ کە وشەیەکی نوێ بە وشەیەکی کۆن دەدرێت.(ستیفن اولمان ١٩٧٥: ١٥٦).

**٢- تیۆرەکانی گۆڕان:**

بۆ لێکدانەوەی گۆڕانی زمان بۆچوونی جیاجیا هاتۆتە ئاراوە گرنگترین ئەم تیۆرانەش بریتین لە:

أ- تیۆری سووککردنی ئەرك:

قسەکەری هەرزمانێ هەوڵدەدات کورترین دەربڕین و کەمترین کات بەرامبەرەکەی خۆی تێ بگەیەنێت، ئەمیش لەو ئارەزووەی مرۆڤەوە هاتووە بۆ ئاسانکردنی دەربڕین (ابراهیم الیس:١٩٧٥:٦٧) و سوککردنی ئەو ئەرکەی کە دەکەوێتە سەرماسولکە و ئەندامانی ئاخاوتن ،بەم پێیە هەموو ئەوگۆرانانەی کە لە زماندا روودەدات وەك: توانەوە و کرتاندن و جیابوونەوە و جێیگۆرکێ و لەناوچوونی ئامراز و گۆڕان لە ڕێزبوونی کەرەسەی رستە و بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی واتا....هتد.هۆکارن بۆ کەمکردنەوەی ئەرکی دەربڕین و ئەو هێشوە دەنگانە کەرتدەکەن لەم دەنگانەش رزگارمان دەکات کە قورسن و بە ئاسانی بۆمان گۆناکرێت، هەندێ لە زمانەوانان ئەم بیردۆزەیان پەسەند کردووە وەك (ویتنی) بە بەڵگەی ئەوەی،زمانەکانی ئێستا لەهی پێشووتر ئاسانترە.هەندێ گۆران بە پێ ی ئەم بیردۆزە چاك لێکدەدرێتەوە (محمد معروف فتاح:١٩٩٠:١٢٥).

ب- تیۆری چینکاری:

بە پێی ئەم بیردۆزە زمان لە شێوەی پێکهاتنی دا وەك زەمین وایە (چین لەسەر چین) دروست بووە،واتە زمانێك کەلەناوچەیەك بلاْودەبێتەوە وەك خۆی نامێنێت وکاری تێ دەکرێت لە لایەن ئەو زمانەی کەلەپێش ئەودا لە ناوچەکەدا هەبووە.بۆ نموونە: زمانی (رۆمانی ) کە لە فەرەنسای کۆن دا بلاْوبۆەوە کەوتە ژێر کاریگەری

زمانی(کێلتی) کە پێشتر لەناوچەکەدا بووە. هەروەها بەپێ ئەم بیردۆزە زمان لە رووی دەنگ و وشەوە، کار لەیەک دەکەن ئەمەش ڕەخنەی لێ گیرا، چونکە زمانی ئینگلیزی لە ئەمەریکا هیچ کاریگەرییەکی نەکرا سەر لە لایەن ئەو خەڵکانەی کە بە بە زمانەکانی ئەڵمانی،فرنسی،مەجەری قسەیان دەکرد لە ئەمریکا (عبدالله عزیز محمد :١٩٩٠: ١٤).

ج- تێوری مارتنێت:

بەباوەڕی زمانەوانی فرنسی (مارتنێت) هەموو زمانێك لەگەڵ پەیدا بونیا هۆکاری گۆڕانی لەگەڵدایە، چونکە هەموویان ئەو ئارەزووەیان تێدایە کە ئاسان بن وئەرکێکی زۆر نەخەنەسەر ئەو کەسانەی کە قسەیان پێدەکەن و بەکاریان دێنن، جا لەبەر ئەوەی زمانیش ناوێزەییەکی زۆری تێدایە، ئەم دیاردە ناوێزانەش تارادەیەك زمانیان لاسەنگ کردووە قسەکەران هەمیشە بەدوای هێنانەوەی هاوسەنگیەوە وێڵن و هەموو ئەو گۆرانانەی دێتە کایەوە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکرێ، بێ گومان ئەم ئامانجەی قسەکەرانیش هەرگیز نایەتەدی، چونکە هێنانەوەی هاوسەنگ لەلایەك دەبێتە هۆی لاسەنگی لەلایەکی تری زمانەکە، بەم جۆرە کێشە کە بەردەوام دەبێت وزمان وگۆڕان شان بەشانی یەکتردەڕۆن، تەنیا کاتێ زمان لە گۆڕان دەکەوێت کە لە ناو بچێت (محمد معروف فتاح :١٩٩٠: ١٢٤).

د- تیۆری ڕووداوی مێژوویی کۆمەلایەتی:

هەندێ لە زمانەوانان گۆڕان دەدەنە پاڵ ڕووداوی مێژوویی وکۆمەلایەتی وەك شەڕوشۆر و جەنگی بەربلاو و داگیرکردن و برسیەتی ونەخۆشی و کۆچ و باری نائاسایی ونوێکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی وولات، ئاشکرایە کەهەریەکێ لەم دیاردانە دەبێتە هۆی گۆڕانی زمان، بەلام دیسان ئەم دیاردەیە هەموو گۆڕانێکمان بۆ لێکنادەنەوە (محمد معروف فتاح :١٩٩٠: ١٢٤).

ھ- تیۆری زمانی دایك:

بە پێی ئەم بۆچوونە گۆڕانی زمان دەگەڕێتەوە بۆ کاری دوو زمان یان زیاتر لەسەر یەکتری، ئەوانەی فێری زمانی بێگانە دەبن ئاسایی بەر لەمەش زمانی دایکی خۆیان دەزانن، ئینجا یان زمانی دووەم بەتەواوی فێرنابن یان زمانەکەی خۆیان دەگۆڕێ، لە هەردوو باردا زمان گۆڕان دێتەکایەوە وەك ئەوەی ئەوگۆڕانەی بەسەر ئینگلیزیدا هاتووە لە هیندستان (محمد معروف فتاح :١٢٤: ١٩٩٠).

**٣- هۆیەکانی گۆڕانی واتا:**

گومانی تێدانییە کە زمان بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێت،ئەم گۆڕانەش هەمووزمانەکان دەگرێتەوە پابەندی یاسا گشتییەکانی گەشە و گۆڕانن (جۆرج فندریس :١٩٥٠:٢٤٦) بۆ دیاردەی گۆڕانی واتا دووهۆ کاری سەرەکی هەن:

**أ- بەمەبەست داهێنان** Innovation :

ئەم جۆرە گۆڕانە دەگرێتەوە کە بە ئاگاییەوە ئەنجام دەدرێت لە دوو رێگاوە:

١- ئارەزوومەندان و شارەزایانی بواری ئەدەب بۆ کاریگەریکردنە سەر خوێنەر بەکاریدێن (احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٤٢).

٢- یان کۆڕ و کۆمەڵە و دەستە زمانەوانییەکان ئەنجامیدەدەن کاتێك وشەیەك یا زاراوەیەك دادەڕێژن یان واتایەکی نوێ بە وشەیەکی کۆن دەبەخشن، ئەم جۆرە هۆکارە کاریگەرییەکی سنووورداری هەیە و زۆر جێگای بایەخ نییە (رمضان عبدالتواب :١٩٨٢:١١١).داهێنانەکانی زمان زۆرن کە واتا دەگۆڕن و گشت ئاستەکانی زمان دەگرێتەوە بۆ نموونە مەحوی لەم دێرە شیعرەدا وشەی (رۆیاندن) ی بەکارهێناوە کە بەمانای بە (رۆیشتن)دێ ، کە داڕشتنەکی نوێیە (تانگە عمر حمە صالح:٢٠٠٩:٧٤):

(مەحوی)! بە(موتوا) وە کە لە مردن ببێ نەجات

ڕۆیاندنت لە پێشە، لە پێشا وەرە بـــــــــڕۆ.

هـــەروەهــــا لە دارشتنی وشەی (دڵستان) دا مەحــــوی دەڵێت:

لە ڕوخساری لەتیفی: گوڵ، لە جەعدی عەنبەرینی دڵ.

دەجۆشێت و دەبارێ، ئەو گولستان، ئـەم دڵستان.

شـاعیر لـەم دێـرە شـیعرەش وشـەی نـوێی دارشـتووە (دڵ) و پاشـگری شـوێن (سـتان)ی لێکداوە و بـووە بـە (دڵستان). وێنەیـەکی ڕوونبێـژی لەسـەر بنـەمای (خواستن) دروست کردووە:

لێ خواستراو: گوڵ.

بۆ خواستراو: یار (دەرنەکەوتووە).

نیشانەی خواستن (ڕوخساری لەتیف) واتە دەم وچاو ی جوان (تاڤگە عمر حمەصالح ٢٠٠٩: ٧٥).

داهێنانەکان ئاستی ڕستەسازیش دەگرنەوە کە لە ئەنجامی پـاش و پێـشکردن و هەڵژاردنی وشە و دەربڕینی ناراستەوخۆ ....هتد ئەنجام دەدرێت وەك:

١- خزمەکانت بێش تۆ دەمرن.

٢- تەمەنی تۆ لە خزمەکانت درێژتر دەبێت.

هەردوو ڕستەکەی سەرەوە هـەمان واتـا دەدات، بـەڵام گـوێگر ڕسـتەی دووەمـی پێخۆشترە.یان ڕستەیەکی وەك:

- چایەکەت سارد بوەوە.

ئەم ڕستەیە لە ڕاسـتیدا ڕسـتەیەکی فەرماندانـە، بـەڵام بـە لەشـێوەی هەواڵـدان دەگوترێت ئەمە بە داهێنان دادەنرێت، چونکە فـەرمانکردن بـە میـوان کاریگـەری دەروونی خراپ دروست دەکات، بەڵام هەواڵدان ئەم کاریگەرییەی نییە.

**ب- بێمەبەست:**

ئەم هۆکارانە دەگرێتەوە کە نەخوازراو و بێمەبەست و بێویستن و دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا و لە توانای کەسیشدا نییە بیوەستێنێت، هەروەک زمانەوانی فرەنسی (مێلێت Meillet) ئاماژەی بۆ دەکات سێ هۆکاری سەرەکین، کە بریتین لە (زمانی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی) ( احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٣٧)، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هۆکاری تر هەن لەمانەش:

**١- هۆکاری زمانی:**

ئەو گۆڕانکارییە کە خودی زمانەکە خۆی تیادا بەر پرسیارە ئەمەش لەوەوە هاتووە زمان بەرە و ئاسانبوون هەنگاو دەنێت کە هەموو ئاستەکان دەگرێتەوە:

أ- ئاستی دەنگسازی:

هۆکاری گۆڕانی دەنگ لە ووشەکانی زمان دا دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی مرۆڤ کە هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات کە لە دەربڕینی ووشەکان دا ئەرکی ئەندامانی ئاخاوتن (سووک) و کەم بکاتەوە ( محمد معروف فتاح :١٩٩٠:١٢٥).بێ گومان هەر ووشەیەک دەنگێکی لێ بسوێت وشەیەکی تری لێ دروست دەبێت و واتایەکی نوێ دەدات دەبێتە(هاوبێژ) وەک:(ددان) سوانی فۆنیمی(د) وادەکات ببێتە (دان) یان سوانی لە وشەی (سەد) وادەکات ببێتە (سە) کە واتای (سەگ) دەدات .جێگۆڕکێ و دەنگ گۆرکێش بەهەمان شێوە دەبێتە گۆڕانی واتای لاوەکی، وەک ئەم شوێن گۆڕینەی لە نێوان (تەرزە) و (تەزرە) دا هەیە واتایەکی تری پێبەخشیوە، کە واتای شێوازییە.کە (تەرزە) لە شێوەزاری سلێمانی دەگەیەنێت و(تەزرە)ش شێوەزاری هەولێر.دیسان دەنگۆڕکێی (وو) بە (ۆ) لە وشەی (سۆر) بۆ(سوور) واتای شێوازی گۆڕیوە،کە (سۆر) لە شێوە زاری هەولێر بەکاردێت و(سوور) یش لە شێوەزاری سلێمانی.هێز و ئاواز و خێرایی قسەکردن هۆکارێکن بۆ گۆڕانی واتا.

لێكچوونی وشـه لـه رووی گۆكردنـەوە وادەكـات واتـا لەیـەك وەربگـرن ئەمـەش دەبێتـەهۆی ئـەوەی كـه كەسـانی ناپـسپۆر لێكدانـەوەی میللـی و شـیكرنەوەی ناراستی بۆ بكەن (سالم سليمان خماش:١٤٢٨: ٨١).بۆ نموونـه (كـەر) رەگـی كـاری كـردن و پەیوەنـدی نییـه بـه (كـەر) ی (گوێدرێـژ) تـەنها لەبـەر ئـەوەی هاوبێـژن دەبیـنین واتاكەیان بۆ گواستۆتەوە بۆیـەش هـەوڵی گـۆرینی دەدەن گـۆڕانی (یاریكـەر) بـۆ (یاریزان) لەبەر تەنینەوەی دەنگی بوو ئەگەر نا دوو وشەكە لە بنچینەدا جیاوازن. دیسان پاشـگری تـری وەك (دان) كـه پاشـگری شـوێنه، بـەڵام بـەواتای (دان) ی چاوگی (پێدان) لێكدراوەتەوە یان پاشگری (گا) كـه دیـسان لەگـەڵ شـوێن دێـت، بەڵام به (گا) ی ئاژەڵ لێكدراوەتەوە،...هتد.

ب- ئاستی رێزمان :

ئاشكرایه كه رێزمان بریتیه له له (وشه سازی و رستەسازی) :

١- ئاستی وشەسازی:

دارشتن ولێكدانی وشه كارله گۆڕانی واتادەكـات و هـەرگۆڕانێك لـه فـۆرم دەبێتـه گـۆڕانی واتـا.وەك:سـارد+ ی = سـاردی كـه هـەموو ساردەمەنییه گازییـەكان دەگرێتـەوە. یـان بـان+گێـڕ= بـانگێڕ كـه ئـەو ئامێرەیـە كـه سـەرخانووی پێدەپەستنەوە.

٢- ئاستی رستەسازی:

بەكارهێنانی وشه لەناو رسته و رێزكردنی كەرەستەكان دەبێته هۆی گۆڕانی واتا وەك:

أ- لێدانێكی (باش)م لێدا.

ب- ئیشەكەم بۆ(باش)كرد.

باش له هـەردوو رسـتەدا واتایـان جیاوازە،لـه رسـتەی (أ) بـه واتـای (زۆر) وەیـا (خراپ) هاتووە وەك:

– لێدانێکی خراپم لێدا.

که هەر هەمان واتای رستەی (أ) دەگەیەنێت و لە رستەی (ب)دا بە واتای (چاك یا تەواوکردن) دێت.

لادانی بەرکار هۆکارێکی ترە بۆ گۆڕینی واتا لە رستەدا ئەمەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە قسەکەر کەمترین کەرەسە و ووزە بەکاربێنێت و شتی زیاد نەڵێت (عبدالواحد دزەیی و ابراهیم عزیز ٢٠٠٦: ٨٤). بۆ نموونە:

أ– تاقیکردنەوەکەت کرد؟

ب– ئا کردم.

بەرکار لە رستەی دووەم لادراوە، کە وەڵامی رستەی یەکەمە، بەڵام ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا، چونکە لەوانەیە گوێگر بیری بۆشتی تر بچێت و بەمەبەستی تر لێکی بداتەوە،لەگەڵ ئەوەشدا گوێگر لەمەبەستی قسەکەر دەگات مەبەستی چییە و چیکردووە.

ج– دەوروبەری ئاخاوتن:

دەوروبەر باشترین رێگایە بۆ تێگەیشتن و واتای کتومت ی ووشە، چونکە بەکارهێنانی وشە لە دەوروبەری جیاوازدا هۆیەکە بۆ گۆڕانی واتاکەی، بۆ نموونە ووشەی (دەرچوون) لای قوتابی واتای (سەرکەوتن) لە وانەکانی دەگەیەنێت، لای شوفێرێك واتای (ڕۆیشتن) دەگەیەنێت.وشە وە یا رستە کاتێ بە دەوروبەر ببەستینەوە ئەوا وشەکان واتای فەرهەنگی خۆیان وون دەکەن و بەپێی دەوروبەر واتای نوێی خۆیان وەردەگرن.(عبدالله عزیز محمد ١٩٩٠: ٦٥) بۆ نموونە وشەی (باش) ئاوەڵناوە و پێوانەیە بۆ کەس و شت، بەڵام لەگەڵ گۆڕینی دەوروبەرەکی واتاکەی دەگۆڕێت: قوتابیەکی باشە. واتە زیرەکە، یان پارەیەکی (باش) ی لە بانکدا هەیە.واتە پارەیەکی (زۆر) ی لە بانکدا هەیە.

ﻫ- لادانی زمانی:

هەندێ جار ئاخێوەران وشەیەك بە وشەیەکی تر دەگۆڕنەوە کە لە رووی واتاوە لەیەك نزیکبن و لەلایەن کۆمەڵیشەوە بە ئاسانی پەسند دەکرێت، ئەوا دەچێتە خانەی خوازە هەندێ جاریش لادان لە ئەنجامی تەمومژی و خراپ تێگەیشتن دەبێت، کە زمانەوانان هەڵیدەسەنگێنن و راستی دەکەنەوە زۆر جاریش رەتی دەکەنەوە هەرچەندە کۆمەڵیش پەسەندی کردووە،وەك ئەوەی منالْ کۆتر بە کێشکە یا رەشۆڵە بە قەلەرەش ناوببات (احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٤٠). هەرچەندە لادان بەهێز تر بۆ ئەوا کاریگەری بەهێز تر دەبێ.(مازن الوعر :١٩٩٤:١٥٨) لادانی واتایی بەزۆری لە هونەرەکانی رەوانبێژی وەك لێکچواندن و خوازە و خواستن و درکە.. هتد. کە لادانە لە یاسای زمان (جان کوهین :١٩٨٦:٦٦) بۆ نموونە لێکچواندنی (یار) بە (گوڵ) هەستی بەهێزی کەسەکە دەگەیەنێت و واتایەکی زیادەی خستۆتە سەر واتای (گوڵ).

زۆرجار لادانەکان لە رێگای زیادەرۆییەوە Hyperbole دەکرێت، زیادەرۆیی بریتییە لە چڕکردنەوە و خستنە سەر،ئەمەش دەوەستێتە سەر توانای دارشتن و خێرایی جولانەوە لە نێوان فۆرم و واتادا لەگەڵ هاوسەنگی و هاوتەریبی نێوان یەکە زمانییەکان.زیادەرۆیی بریتییە لە بەخشینی پلەیەکی بەرز بۆ گوێگرتن هەروەك شێخ رەزا دەڵێت:

بە تەحریکی تەلێکی سەد هەزار نەفسی بە کوشتن دا،

رەئیسی حیلەکارانە شای قوماربازانە،ئەم ریشە

ئەم دێرە زیادەڕۆییەکی زۆری تێدایە،چونکە بە جووڵانەوەی تەڵەریشێك چۆن سەد هەزار کەس بە کوشتن دەچێ؟ (عبدالواحدمشیردزەیی(لادانی واتایی...):٢٠٠٧:٤٧).

زیادەرۆیی دوو کاریگەری هەیە یان کەسەکە بریندار دەکات،یان بەرزی دەکاتەوە .(عبدالقادر عبدالجلیل:٢٠٠٦:٢٥٦).هەروەك لە هەجوو و پیاهەڵداندا بەدیدەکرێت

هەروەك شێخ رەزا (عبدالواحد مشیر دزەیی ٢٠٠٧: ١٣٧) دەڵێت: (مەعروف) كە حیزی وەك ئەو نەبوو لە نەسلی ئادەم.

ئازاری............ راكشــــا لەســەر دەم.

مردم ..ئەوەندە....خۆم كوشت... پــیادەم.

یان لە هەندێ دەربڕینی وەك:سووتام لە گەرمان.یان خنكام لە تێنان.كە روویان نەداوە،بەڵام زێدەڕۆیی تیاكراوە لە گوتنەكە.(فتاح ماما علی ٢٠٠٧: ١١).

٢- هۆكاری كۆمەڵایەتی:

بایەخ دان بەكۆمەڵ پاش بڵاوبونەوەی بیروراكانی قوتابخانەی(دوركایم)ی كۆمەڵایەتی بڵاوبۆوە، دیارە ئەویش لەبەرئەوەیە زمان كەرەسەیەكی گرنگی لە یەك گەیشتنە لە كۆمەڵدا و هەر گۆڕانێك لەژیاندا روویدات لە زمانەكەدا رەنگ دەداتەوە (عبدالله عزیز محمد ١٩٩٠: ٦٥).هۆكاری كۆمەڵایەتی بە سێ شێوە دێتە كایەوە:

١- گەشەی كۆمەڵایەتی یەكێكە لەم هۆكارانەی كە واتا دەگوازێتەوە لە شتی بەرجەستەوە بۆ ئەبستراك ئەمیش لە ئەنجامی پێشكەوتنی ئەقڵی مرۆڤ. بۆ نموونە (زاخاودان) تەنها لە بواری زەڕەنگەری ومسگەری بەكاردەهات لە ئەنجامی ئەوەی، مرۆڤ هەستی بە پاككردنەوەی مێشكی كرد بەهۆی بینینی چەند دیمەنێكی خۆش وسەرنج راكێشەوە گۆڕا بۆ (بۆزاخاوی مێشك) (عبدالله عزیز محمد ١٩٩٠: ٦٦) .بەهەمان شێوە لە پاككردنەوە لە پاككردنەوەی ماڵ و قاپ و شتی تر ئێستا بۆ پاكردنەوەی دڵ و دەروون بەكاردێت.

٢- لە رێگای رێكەوتنی كۆمەڵێك كەس كە خاوەن بیرورایەكی جیاوازن لە كەسانی تر ئەمەش وادەكات زمانێكی نوێی تایبەت Jargon بێتە كایەوە.وەك گواستنەوەی ناوی گۆرانیبێژ و هونەرمەند و ناودارەكان بۆ ئۆتۆمۆبیلەكان لە لایەن چەند

کەسانێك کە لە پێشەنگاکانی ئۆتۆمۆبیل کاردەکەن،وەك ناوی:(لەیلاعلوی،مۆنیکا، وەنەوشە و ........هتد) کە گوایا پەیوەندی جوانی لە نێوانیاندا هەیە.

٣- بەکارهێنانی وشە کۆنانەکان بەواتایەکی نوێ بۆ ئەو شت و کەلوپەلانەی کە هەستکراوە بە هەمان ئەرك هەڵدەسێت، هەرچەندە لە شێوە و قەبارە گۆڕاوە (احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٢٨).وەك: وشەی(مەکۆ) کە پێشتر جۆڵاکان ئەم ووشەیان لە بواری رستن و چنین بەکاردەهێناو بە دەستیانەوە دەگرت بۆ چنینی (بەرماڵ، جاجم...هتد)، بەلاَم ئێستا هەمان وشەی(مەکۆ) لە دروومان بەکاردە هێنن کە زۆر جیاوازە لە مەکۆ کۆنەکەی پێشوو (عبدالله عزیز محمد:١٩٩٠:٦٧).

٣- هۆکاری ئابووری:

بەرەوپێش چوونی باری ئابوری و رەنگدانەوەی لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا وا لە قسەکەرانی زمان دەکات بۆ خۆگونجاندن،لەگەڵ ئەم پێشکەوتنەی باری کۆمەلاَیەتی،دووڕێگا بەکاربێنن:

ا- زیندووکردنەوەی ووشە کۆنەکانی زمان و بەکارهێنانیان بۆ ناونانی دیاردە نوێیەکان لەگەڵ ئەوەشدا کەبابەتەکەی گۆڕاوە.وەك:قەیناغ و داس و شەنە و....کە پێشتر لە بواری دروێنەکردن بەکار دەهات ئێستا ئەم ناوانەیان لە ئامێری دروێنەکردن نوێکراوەتەوە.

ب- دروستکردنی ووشەی نوێ ئەمیش بە دووڕێگا دروست دەبێت :

١- وەگرتنی راستەوخۆ لە زمانی بێگانەوە (رادیۆ،تەسجیل،سیدی،کۆمپیوتەر، دیڤیدی،رام،هارد، فلاش،میمۆری...هتد).

٢- دارشتن:لەئە نجامی بەرهەمی تاکەکەسێك بێت یان لە رێگای کۆرە زمانیەکانەوە بێت (کۆزمانەوانی،زانکۆ،گشتاندن،شیردەر،...هتد).

**٤- هۆکاری دەروونی:**

ڕەنگدانەوەی باری دەروونی کەس و کۆمەڵگا نیشاندەدات کە چوار شێوەی هەیە (سالم سلیمان خماش:١٤٢٨: ٧٢):

أ- تابۆبوون:

زمان هەندێ وشە لە بەکارهێنان قەدەغە دەکات لەبەر ڕەنگدانەوەی ئەو واتایە خراپەی کە هەیەتی یان لەبەر ئەو واتا روون و ئاشکرایەی کە لە زمانەوانیدا پێیان دەوترێت (تابۆ)،کە شێوازێکی تری دەربڕینە (احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٤٠) کە زیاتر کردە سێسییەکان و ئەندامانی زاوزێ و ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کەم نرخن وەك:(زێ) یان (گیان) بۆ کۆ ئەندامی زاوزێی مێینە و (زەکەر) بۆ کۆئەندامی زاوزێی نێرینە و......هتد ناونانی (پیسایکردن) بە (دەست بە ئاوگەیاندن) و ناونانی شوێنی پیسایکردن بە (ئەدەبخانە) یان (w.c).

ب- دەربڕینی جوان:

وەك ئەوەی لە بری وشەی (کوێر) وشەی (نابینا) یان لەبری وشەی (درۆ) وشەی (ناراست) بەکاربێنین.ئەمەش بۆ ڕێزگرتن ودڵ ڕاگرتنە و کار ناکاتە واتا بنچینەییە کە.

ج- ترسان لە چاوزار:

لە ترسی حەسوودی و چاو و زار هەندێ کەس بە(جنۆکە) دەڵێن: (لە ئێمە باشتر).و بەشتی باش دەڵێت خراپ و بە جوان دەڵێت ناشیرین و بە زیرەك دەڵێن تەمبەڵ.....هتد.

د- زیادەڕۆیی:

لە ئەنجامی هەڵچوونی زۆرەوە دێتە کایەوە کە یەکێك بە شتێك سەرسام دەبێت. بۆ نموونە بە کچێکی زۆر جوان بگوترێت (شازە) یان هەندێکجار دەگاتە ڕادەی کوفر وەك دەڵێن:

- خوا بۆ خۆی دروستیکردووە.

کە مەبەستیان جوانییەکی رادەبەدەرە....هتد.

**٥- هۆکاری مێژوویی:**

ئەمەش لە ئەنجامی گۆڕانی کۆمەڵگا و شت و تێڕوانین بۆیان دێتە ئاراوە، کە دەتوانین بەم شێوەیە جیایان بکەینەوە:




أ- گۆڕانی شت و مانەوەی وشەکە:

ئەو شتە دەگرێتەوە کە لە شێوە و قەبارە گۆڕاوە وەك ئۆتۆمۆبیل و خانوو،جل و بەرگ،....هتد.

ب- گۆڕانی هەڵوێستمان بەرامبەر شتێك:

هەرکات هەست و هەڵوێست و بۆچوونمان دەربارەی ئاماژە بۆکراو گۆڕا ئەوا گۆڕانکاری واتاشی بەدوایەوە دێت.بۆ نموونە عەرەق لەسەردەمی پێش ئیسلامدا هێمای شانازی و مێوانداری بوو، بەڵام دوای ئیسلام گۆڕا بۆ حەرام.

ج- گۆڕانی زانینمان دەربارەی شتێك:

زانیاری مرۆڤ لەگەڵ پێشکەوتن دەگۆڕێت بۆ نموونە پێشتر زانایان وایان دەزانی کە گەردیلە Atom بچووکترین کەرتە و ناتواندرێت دابەشبێت، بەڵام زانستی فیزیای نوێ دەری خست دانەی وردتر هەیە لە گەردیلە وەك: (ئەلەکترۆن و پرۆتۆن و

نیوترۆن) (سالم سليمان خماش:١٤٢٨: ٧٢). هەروەها دەبینین پێناسەی وشە و رستە و واتا تاکو ئێستا چەندین گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

ئێمە زۆر لە وشە کۆنەکان بەکاردێنین لەسەدەمی ئێستادا هەروەك (وۆلدرۆن woldron) ئامازەی بۆ دەکات زۆر لە داهێنانە نوێیەکان وشەی کۆنیان بۆ بەکاردێت (احمد مختار عمر:١٩٨٢: ٢٢٨).دواتر بە درێژی باسی لێوەدەکەین.

## ٦- پێداویستی بۆ ناونان :

زمان هۆیەکی پەیوەندیکردنە کە لەسەر بنەمای بەکارهێنانی هێما کار دەکات کە شت و بۆچوون دەنوێنێت (سالم سليمان خماش:١٤٢٨: ٧٤) بۆ نموونە چەندین وشەی وەك: دادخواز،خێرخــواز ،خزمەتگوزار،بەنداو،فرگــە ،فێرخواز،کــەم ئەنــدام، خــاوەن پێداویــستی تایبەت،بەفکر،ساردکەرەوە... .هتــد.لــە ئــەنجامی پێداویــستی درووستبووە.

## ٧- زۆر بەکارهێنانی وشە :

زۆر وشــە هەیــە بــەکار هێنانیــان زۆرە لــە بــوارە جیاجیاکانــدا ئەمــەش وادەکـات واتاکەی تەسك بێتەوە و تایبەتمەندبێت.وەك وشەی (چاندن) لە:

- چاندنی گورچیلە.
- چاندنی پرچ
- چاندنی ددان
- چاندنی گوڵ
- چاندنی مین (سالم سليمان خماش:١٤٢٨: ٧٤).

### ٨- هۆکاری هۆشەکی:

بوونی پەیوەندی هۆشەکی لەنێوان شتێك و شتێکی تر هۆکارێکی ترە بۆ گۆڕانی واتا.کە خواستن و خوازەکان دەگرێتەوە کە لێکچوون هەیە لە شێوە یان ئەرك (سالم سلیمان خماش:١٤٢٨، ٧٢تا ٧٦) بۆ نموونە: (ددانی مشار) و (ددانی مرۆڤ) (چاوی مرۆڤ) و (چاوی سۆپا)....هتد.هەندێکجاریش ئەم لێکچوونە بەدی ناکرێت، بەڵام پەیوەندیتر بەدیدەکرێت وەك ئەدگار و هۆ و شوێن و کات....هتد.بۆ نموونە:

- ئاگرێك لە پۆل دانیشتووە.

لێرەدا لە ڕێگای شوێنەکەیەوە دەزانین (ئاگر) قوتابیە نەك ئاگری ئاسایی، هۆی ناونانیشی بۆ ئاگر دەگەرێتەوە بۆ (زیرەك)ی قوتابیەکە یان (شەیتان) ی قوتابیەکە.

### ٤- شێوەکانی گۆڕانی واتا:

#### أ- فراوان بوونی واتا Widening of Meaning:

فراوانبوونی واتا دیاردەی گۆڕانە لە واتایەکی تایبەتەوە بۆ واتایەکی گشتی فراوان بوونی واتای ووشە لە زماندا وەك ئەو دیاردەیە کە منالێك بە کاریان دێنێ، کاتێك ئەیەوێت ناو لە شتێك بنێت فراوانی دەکاتەوە بۆ هەموو ئەو دیاردانەی کە جۆرە لێکچوونێك لە نێوانیان دا هەیە بۆ نموونە منداڵ ووشەی (بابە) بۆ هەموو کەسێ بە کاردێنێ کە لە باوکی بچێ دا (ابراهیم انیس:١٩٧٦ ؛ ١٥٥) و وشەی (بەعە) بۆ هەموو ئاژەلێك....هتد.

مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا هەوڵ دەدات ئەرکی ئەندامانی ئاخاوتن کەم بکاتەوە.بە واتایەکی تر فراوانی واتای ووشە دیاریدەیەکی بەربڵاو و سوودبەخشە لە هەموو زمانێکدا.بۆ نموونە وشەی (دەفتەر) واتاکەی لە دەفتەری پەڕاوەوە فراوانبووە و بۆ (١٠٠) وەرقەی دۆلارە بەهەمان شێوە وشەی(مێش) جگە لە واتا بنچنەییەکەی

واتای بۆیەکردنی پرچیش دەگرێتەوە.هەروەها وشەی (نان) بەهەمان شێوە جگە لە کولێرە واتای خواردن و بژێوی ژیانیش دەگرێتەوە (محمد معروف فتاح ١٩٩٠: ١٠١)

ب- **تەسکبوونەوەی واتا** Narrowing of Meaning:

ئەم دیاردەیە کاتێ روودەدات کە مرۆڤ وشەیەك لە سنورێکی فراوان و بەربلاوەوە دەبات بۆشوێنێکی تر و بەم پێیەش تایبەتی پەیدادەکات.لە تەسك بوونەوەی واتادا وشە واز لە واتا گشتییەکەی خۆی دێنێ و تایبەتمەندی لە واتایەکی تەسکتر پەیدا دەکات لەوانەشە هەردوو واتاکەی بپارێزێت واتە واتا گشتییەکەی هەبێت و بە واتایەکی تەسکتر بەکاربێت (محمد معروف فتاح:١٩٩٠: ١٢٢) تەسکبوونەوەی واتا تایبەتیکردن، دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەچەند سیمایەکی واتایی زیاتر خراوەتەوە سەرسیمای شتێك (احمد مختار عمر:١٩٨٢: ٢٣٧).کە دەبێتە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگ لە رووی زاراوە زانستییەکاندا (عبدالله عزیز محمد :١٩٩٠: ٧٨).تەسکبوونەوەی واتا سنوورێکی بچووکی گۆڕانکاری واتا داگیر دەکات و گۆڕانکاری واتاش دەچێە سنووری ئیتیمۆلۆجییەوە،بەم شێوەیە:



بەم پێیە گۆڕانکاری لە زمان ڕوونادات هەتا بواری ئیتیمۆلۆجی وشە دروست نەبێت، بواری ئیتیمۆلۆجیش دروست نابێت هەتا گۆڕانکاری بەسەر زمان و واتادا نەیێت، تەسکبوونەوەی واتاش چەمکێکی گۆڕانکاری واتا دەگرێتەوە، واتە تا تەسکبوونەوە روو نەدات ئەوا گۆڕانکاری واتا بەرپا نابێت.لێرەدا پێویستە ئەو راستییەش بخرێتە روو کە هەموو گۆڕانکارییەکانی زمان تەنیا لە روانگەی ئیتیمۆلۆجییەوە سەیر دەکرێن،چونکە ئەو ڕێبازە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی باری مێژوویی زمان.لە لایێکی ترەوە پێویستە ئەو راستییەش بخەینەروو کە گۆڕانکاری لە زماندا بەگشتی بەستراوەتەوە بە تێپەڕبوونی کات.واتە تا سەردەمی زیاتر بەسەر زماندا تێپەڕێت ئەوا رادەی گۆڕانکاری زیاتر دەبێت یا بەپێچەوانەوە، بەڵام ئەم بیرۆکەیە بەشێوەیێکی رەها نییە،چونکە وشە و مۆرفیمی وا هەیە کە سەردەمێکی یەکجار زۆریان بەسەردا تێپەڕیوە کەچی واتا و فۆرمەکەی هێشتا لە دەست نەداوە (فتاح مامە علی:٢٠٠٧:٦) وەك:وشەی (کارك) کە واتای ( کەندوو، پێڵاوی چەرمین ، کارژۆڵە ) هەبووە لە سەردەمێکدا، پاشان بە هۆکاری بەسەر چوونی سەردەم دووچاری تەسکبوونەوەی واتا هاتووە و لەو زمانە ستاندەرەی کوردی کە ئیمڕۆ هەمانە، تەنیا بە واتای (کارژۆڵە) بەکاردێت، بەڵام دوو واتاکەی تری (پێڵاوی چەرمین) و (کەندوو) یەکەمیان ئەمڕۆ لە زمانی کوردی لە کارکەوتووە و بەکارنایەت، هەرچی(کەندوو)ە دیسان لە زمانی ئاسایی ئیمڕۆی کوردی بەکارنایەت تەنیا لە چوارچێوەی پەند نەبێت (فتاح مامە علی:٢٠٠٧:١٠) یان وشەیەکی وەك: (شین) کە پێشتر بە رەنگە تۆخەکان وتراوە و جگە لەمەش بووە کەلتوورێك کە بریتی بوو لەخۆدان پرچ ڕنانەوەی ئافرتان لە داخی لە دەستدانی کەسێکی ئازیز، بەڵام ئێستا تەنها بەواتای رەنگی(شین) ماوەتەوە.

**ج- گواستنەوەی واتا Transference of Meaning:**

(ڤندریس) لە بارەی گواستنەوەی واتاوە دەڵێت: گواستنەوەی واتا کاتێك ڕوودەدات، کە هەردوو واتاکە بەرامبەر و یەکسان بووەستن لەگەڵ یەك وهیچ جیاوازیەکی گشتی و تایبەتی نێوانیان دا نەبێت (عبدالقادر عبدالجليل ٢٠٠٦: ٣٤٢) وەك: گواستنەوەی ووشە لە هۆکارەوە بۆ(هۆ) وەیا بە پێچەوانەوە. کە بە چەند شێوەیەك دەبێت لەمانەش:

ا- خواستن:

ئەم ووشانەی کە بەم ڕێبازە لەزمان دا هاتوونەتە شاراوە بوون بە کەرەسەی لێکۆڵینەوە لای فەیلەسوف ودەروونناس وئەدەیب و زمانەوانان، چونکە هەریەکێك لەوجۆرە زانایانە بە پێ ی شارەزایی و بۆچوونی خۆی و کارکردنی لە مەیدانێکی تایبەتی لە زانست دا لێیکۆڵیوەتەوە (عبدالله عزيز محمد ١٩٩٠: ٧٨). خواستن بریتییە لە هەڵبژاردنی هێمایەك بە پێی لێکچوونی واتایی لە شوێنی هێمایەکی تر لەسەر تەوەرەی ستوونی (عبدالسلام نجم الدين ٢٠٠٨: ١٤٦) وشەی خواستراو دەبێ دوو تایبەتی تیابێ:

١- لەرووی شێوەوە و دیمەن و شوێن و کاتەوە لە یەك بچن. بۆ نموونە (ملی شووشە) لە شێوە لە (ملی مرۆڤ ) دەچێت و (سەری مەنجەڵ) لە رووی شوێنەوە لە (سەری مرۆڤ) دەچێت و(کورتە چیرۆك) لە رووی کاتەوە واتاکەی خوازراوە (محمد معروف فتاح ١٩٨٦: ١١٠). هەروەك بینیمان دەبینین وشەی پرتوقاڵە واتاکەی لە میوە وە گواستراوە بۆ کچێك لەسەر بنەمای لێکچوون لە شێوە واتە خری و رەنگ واتە رەنگی پروتوقاڵی.




٢- لـە ڕووی ئەركـەوە لەیـە ك بـچن وەك:دانـی مـشار،باڵی فڕۆكە،دەسـكی دەرگا،تایەی ئۆتۆمۆبێل.(حسن حامد صالح:٢٠٠٢:٨٢) ئۆڵمـان جـۆرێكی تـر لـە خواسـتن دەخاتەڕوو، كە لێكچوونە لە هەست و نەست (ستیفن ئۆلمان :١٩٨٦:١٦٨) وەك: سـڵاوێكی گەرم،یا بەساردی سڵاوەكەی وەرگرتمەوە.. ...هتد.

ب- خوازە :

بە پێچەوانەی (خوازەیی) مەرج نیە لە ئەرك وشێوە لـە یـەك بـچن،بەلام مەرجـە پەیوەنـدییان بـە بەیەكـەوە هـەبێت.خـوازە گواسـتنەوەی واتـای وشـەیەكە بـۆ

وشەیەکی تر لەسەر تەوەرەی ئاسۆی (عبدالسلام نجم الدین ۲۰۰۸: ۱٤۷) بۆ نموونە:دووشت کە یەکیان لەناو ئەوەی تریانەوە بێت زۆرجار بە ناوی شتەکەی یەکەمەوە دووهەم ناودەبرێت بۆ نموونە:(قوتابی) و(پۆل) (عبدالله عزیز محمد ۱۹۹۰: ۷۷) کاتێ دەگوترێت:

- پۆلی چوارەم چوون بۆ دهۆك

واتە: قوتابیانی پۆلی چوارەم چوون بۆ دهۆك.

لە خوازەدا پێویستە لە نێوان واتای گوتراو و واتای مەبەستدا پەیوەندییەك هەبێت.لەوانەش:

١- پێوەندی گشت و بەش:

أ- هێنانی گشت بۆ بەش وەك:ئەمریکا(سیاسەتمەدارانی ئەمریکا) نیگەرانی خۆی دەربڕی.

ب- هێنانی بەش بۆ گشت وەك:برۆ سەرت(سەر،چاو،دەست،پێ،زك، ... هتد) بشۆ.

٢- پێوەندی ناو و ناوەڕۆك:

أ- هێنانی ناو بۆ ناوەڕۆك وەك:مەنجەڵەکە (ئەوەی لە مەنجەڵدایە) دەکوڵێ.

ب- هێنانی ناوەڕۆك بۆ ناو وەك:وریابە بۆنەکە (شوشەی بۆنەکە) نەشکێنی.

٣- پێوەندی پەیوەست و پەیوەستراو:

أ- هێنانی پەیوەست بۆ پەیوەستراو وەك: ئازادی گرك (تا) لێ بوو .

ب- هێنانی پەیوەستراو بۆ پەیوەست وەك:شەربەتەکە (تامی شەربەتەکە) زۆر خۆشە .

٤- پێوەندی ناو و ئاوەڵناو وەك: برۆ قەڵەوەکە بێنە .

٥- پێوەندی دیارخەر و دیارخراو وەك:پەنجەرەکەت شکاوە( پەنجەرەی ژوورەکەت) شکاوە .

٦- پێوەندی هاوسێیەتی وەك:من سبەی دەچمە تاران (ئێران) .

٧- پێوەندی هاودژی وەك: کوڕی باش (خراپ) بۆ درۆ دەکەی .

٨- پێوەندی گشتی و تایبەتی:

أ- هێنانی گشتی بۆ تایبەتی وەك: ئەوە مەم و زین (دوو ئەویندار) هاتن .

ب- هێنانی تایبەتی بۆ گشتی وەك:عێراق (عەلی کیمیاوی) هەڵەبجەی کیمیا باران کرد .

٩- پێوەندی رەگەزی:وەك: دەبرۆ زێرەکانت (بازنە،ملوانکە،...هتد) بێنە .(عبدالسلام نجم الدین: ٢٠٠٨: ١٤٩)،خوازە سێ جۆرە:

١- خوازەی زیندوو Living:

ئەم جۆرەیە کە گوێگر پێی سەرسام دەبێت لە کاتی بیستنی.

٢- خوازەی مردوو Dead:

ئەم جۆرە خوازەیە لەبەر زۆر بەکار هێنانی واتا خوازراوەکەی ونکردووە و بۆتە دروست.

٣- خوازەی خەوتوو Sleeping:

لە نێوان هەردوو جۆرەکەی سەرەوە دایە (احمد مختار عمر:١٩٨٢:٢٤٢).

گواستنەوەی واتا بە سێ شێوە دێتە کایەوە:

١- بەرزبوونەوەی واتا Meliorative Change:

بەرزبوونەوەی واتا ئەو بارە دەگرێتەوە کە بەسەر ووشەیەکدا دێت و لە بنەرەتدا واتا و بارودۆخێکی خراپی گەیاندبێت و ئێستاش وازی لەو واتایەی هێناوە و واتایەکی باشتر و بەرزتری وەرگرتووە (عبدالقادر عبدالجلیل :٢٠٠٦:٢٤٣) بۆنموونە وشەی (شۆخ) کە ئێستا بە واتای (جوان) دێت لە قۆناغێکی پێشتردا بە واتای (بێ حەیا) بەکارهاتووە ( محمد معروف فتاح :١٩٩٠:١٢٤).

٢- نزم بوونەوەی واتا Pejorative Change:

پێچەوانەی بەرزبونەوەی واتایە و کاتێ روودەدات کە ووشە یەك واز لە واتایەکی بەرز و باش یان بێ لایەن بێنێ بە تێپەر بوونی کات و واتایەك وەرگرێ کە سووکی و ریسوایی بگەیەنێ (عبدالقادر عبدالجليل ٢٠٠٦: ٢٤٤) بۆنموونە :ووشەی (بۆر) کە لە ووشەی (بۆرە پیاو) یان (بۆرە سوار) دا دەبینرێ لە بنەرەت دا واتایەکی بێ لایەنی هەبووە نە باش نە خراپ، بەڵام ئێستا ئەم ووشەیە لە زمانی کوردی دا بە مرۆڤێکی بێ بە ها و بێ پارە دەوترێ (محمد معروف فتاح ١٩٩٠: ١٢٤).هەروەها وشەی (تۆز و با) دوای راپەرین لە واتایەکی نزمی وەرگرت،چونکە بۆ کەلوپەلی دزیاری و تاڵان بەکار دەهات. هەروەها وشەی (ئۆمەر) ناوێکی تایبەتی بێلایەن بوو ئێستا گۆڕاوە بۆ سیفەتێکی خراپ کە بە پیاوی ترسنۆك و ژنانی دەوترێت.

٣– تابۆبوون Tabooed:

ئەم گۆڕانە پەیوەندی بە باری دەروونی و بیروباوەرەوە هەیە هەندێ جاریش بە باش دەربڕین ناودەبرێت (عبدالقادر عبدالجليل ٢٠٠٦: ٢٤٦) .ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە مرۆڤ لە کۆنەوە سڵییان لە ناوبردنی راستەقینەی هەندێ رووداو و و گیانلەبەر و نەخۆشی کردۆتەوە،جا بۆ رێزگرتن و خۆ بە دوورگرتن لە رق وکینە و تۆڵە ناوەکانیان گۆڕیوە وەك: ناونانی (سورێژە) بە (موبارەکە) و یان بۆ (مردن) چەندین دەربرینی وەك:(ئەمری خوای بە جێهێنا،کۆچی دوایکرد،دەستی لە دونیا شوشت...هتد بەکاردێت (عبدالله عزيز محمد ١٩٩٠: ٦٩،٧٠).

**سەرچاوەکان:**

**١- بەکوردی:**

١- ئارا علی ئەحمەد (٢٠٠٨) کۆتێن واتایا شێوازی بۆ هەڤ واتایا تەواو،گۆڤەرا بەهدینان،چاپا ئێکێ،چاپخانا خانی،دهۆك.

٢- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٥) وشەی زمانی کوردی،بەغدا.

٣- ئیبراهیم عزیز ئیبراهیم (١٩٨٣) رێنووس،زانستگای سەلاحەدین،کۆلیجی ئەدەبیات،هەولێر.

٤- تاڤگە عمر حمە صالح (٢٠٠٩) زمان وەك داهێنانێکی تاکە کەسی لای مەحوی شاعیر،نامەی ماستەر،زانکۆی سەلاحەددین،کۆلیژی زمان ،هەولێر.

٥- جەمال نەبەز (٢٠٠٨) وشە نامەیەکی ئیتمۆلۆژیای زمانی کوردی، چاپی یەکەم.

٦- رەفیق محمد شوانی (٢٠٠٨) زمانی کوردی و شوێنی لەناو زمانەکانی جیهاندا، چ/١،دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی،هەولێر.

٧- ساکار ئەنوەر حەمید (٢٠٠٩) وشە خواستن لە زمانی کوردیدا،نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین،کۆلیژی زمان ،هەولێر.

٨- عبدالسلام نجم الدین (٢٠٠٨) شیکردنەوەی دەقی شیعری لە رووی زمانەوانی یەوە،چ/١خانەی سپیرێز،چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

٩- عبدالله عزیز محمد بابان (١٩٩٠) گۆڕانی واتای وشە لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب،زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

١٠- عبدالواحد مشیر دزەیی (١٩٩٧) دژواتا و چەند سەرنجێکی واتاسازی، رۆژنامەی هەرێم،ژمارە (٤٤ ).٣- ٢-١٩٩٧.هەولێر.

١١- عبدالواحد مشیر دزەیی (١٩٩٩) هاوواتا لە نێوان بوون و نەبووندا، گۆڤاری مەتین،ژمارە (٨٨).دهۆك.

١٢- عبدالواحد مشير دزەيى (٢٠٠٣) خواستنى فۆنيم لە زمانى كورديدا، باسێكى بڵاونەكراوە.

١٣- عبدالواحد مشير دزەيى (٢٠٠٤) واتاى كاريگەرى لە بوارى ڕاگەياندندا ،نامەى دكتۆرا، كۆلێژى ئاداب،زانكۆى سەلاحەدين، هەولێر.

١٤- عبدالواحد مشير دزەيى (٢٠٠٧) لادانى واتايى لە زمانى شيعردا، گۆڤارى اللغات،ژمارە ١٣، كۆليژى زمان،زانكۆى بەغدا.

١٥- عبدالواحد مشير دزەيى و ابراهيم عزيز ابراهيم (٢٠٠٦) بەركار وەك پێويستييەكى سەرەكى رستە،گۆڤارى الأستاذ،ژمارە ٦٠ زانكۆى بەغدا، كۆليژى پەروەردەى ابن رشد.

١٦- عبدالوهاب خالد موسى (٢٠٠٩) چەند بابەت لێكۆلينێن زمانى،ژ وەشانێن ئيكەتيا نڤيسەرێن كورد،چاپخانا هاوار،دهۆك.

١٧- عەبدولواحيد موشير مەحمود (٢٠١٠) واتاسازى وشە و رستە،چاپخانەى رۆژهەلات،هەولێر.

١٨- فتاح مامە علي (٢٠٠٧) لەبارەى زمانەوانييەوە،كتێبێكى بڵاونەكراوە، كۆليژى پەروەردەى بنيات،زانكۆى سەلاحەددين، هەولێر.

١٩- كۆرش سەفەوى (٢٠٠٦) چەند لايەنێكى واتاسازى، وەرگێڕانى، دلێر صادق كانبى،چ/١.دەزگاى توێژينەوە وبڵاوكردنەوەى موكريانى .هەولێر.

٢٠- كامل حسن بصير (١٩٧٩) زاراوەى كوردى،لێكۆڵينەوە و هەڵسەنگاندن، بڵاوكراوەكانى زانكۆى سلێمانى.

٢١- محەمەد مەحوى (٢٠٠٩) زانستى هێما هێما،واتا و واتا لێكدانەوە. بەرگى يەكەم،زانكۆى سلێمانى.

٢٢- محەمەد مەحوی (٢٠٠٩) زانستی هێما هێما،واتا و واتا لێکدانەوە، بەرگی دووەم،زانکۆی سلێمانی.
٢٣- محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٩) کار پۆلین کردن بەبێ ڕۆنان،گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ ژمارە ١٢١.
٢٤- محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٩) وشەی لێکدراوی بەستراو لە کوردی دا،گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ ژمارە ١٢١.
٢٥- محەمەد مەعروف فەتاح (٢٠١٠) لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان،دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی،چاپخانەی رۆژهەلات.هەولێر.
٢٦- محەممەد معروف فتاح و صباح رشید قادر (٢٠٠٦) چەند لایەنێکی مۆرفۆلۆژی کوردی،هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین.
٢٧- محەممەد معروف فەتاح (١٩٨٦) دیسان ئیدیەم،پێداچونەوەی لەبەر رۆشنایی زمانەوانیدا.گ.کۆڕی زانیاری عێراق،دەستەی کورد، بەرگی(١٥) بەغدا.
٢٨- محەممەد معروف فەتاح (١٩٩٠) زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.
٢٩- نەسرین فەخری (١٩٨٤) پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشە و دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا،لێکسیکۆلۆجیا،گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ،ژمارە (١٠١) دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی،بەغدا.
٣٠- نەسرین فەخری (١٩٨٤) لێکسیکۆلۆجیا،پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشە و دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا، گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ،ژمارە (١٠٢) دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی،بەغدا.
٣١- نەسرین فەخری (١٩٨٥) پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشە و دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا،لێکسیکۆلۆجیا، گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ،ژمارە (١٠٧) دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی،بەغدا.

٣٢- نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی(١٩٨٢) ڕێزمانی کوردی،بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین،هەولێر.
٣٣- هـ.د.ویدووسن (٢٠٠٨) سەرەتایەك بۆ زمانەوانی،و.د.هۆشەنگ فاروق، چاپی یەکەم،چاپخانەی خانی دهۆك.

ب- بەعەرەبی:
١- إبراهيم أنيس (١٩٧٦) دلالة الألفاظ مكتبة الأنجلو المصرية. القاهرةط/٣
٢- أحمدمختار عمر (١٩٨٢) علم الدلالة،مكتبة دار العروبة للطبع والنشر، الطبعة الأولى،الكويت.
٣- اف.ار.بالمر (١٩٨١) علم الدلالة،ت.مجيدماشطة،مطبعة العمال المركزية (١٩٨٥)،بغداد.
٤- جان كوهن (١٩٨٦) بنية اللغة الشعرية ت.محمد الوالي ومحمد العمري، دار البيضاء،المغرب.
٥- جوررج فندريس (١٩٥٠ ) اللغة، ت، عبدالحميد الدواخلي، محمد القصاص، كتبة انجلو المصرية، القاهرة.
٦- جون لاينز (١٩٦٨) علم الدلالة،ت،مجيد الحليم الماشطة،حليم حسين فالح، كاظم حسين باقر،بصرة.
٧- حسين حامد صالح (٢٠٠٣) التطور الدلالى فى اللغة العربية فى ضوء علم اللغة الحديث،مجلة الدراسات الاجتماعية ،العدد١٥ يناير، يونيو،كلية التربية ،جامعة صنعاء اليمن.
٨- رمضان عبدالتواب (١٩٨٢) مدخل الى علم اللغة و مناهج البحث اللغوى، ط/١، القاهرة.

٩- سالم سليمان الخماش (١٤٢٨) المعجم و علم الدلالة،جامعة ملك عبدالعزيز بجدة ،كلية الاداب و العلوم الانسانية، قسم اللغة العربية، الجدة.

١٠- ستيفن اولمان (١٩٨٦) دور الكلمة في اللغة،ت،كمال محمد بشير،مكتبة شباب. بغداد.

١١- عبدالحميد حسن (١٩٧١) الالفاظ اللغوية خصائصها و انواعها.

١٢- عبدالقادرعبدالجليل (٢٠٠٦) المعجم الوظيفى لمقاييس الأدوات النحوية والصرفية ،ط/١دار الصفاء للنشر و التوزيع،عمان.

١٣- عزمى اسلام (١٩٨٥) مفهوم المعنى دراسة تحليلية،حوليات كلية الآداب ،الحولية السادسة،جامعة الكويت.

١٤- كلودجرمان و ريمون روبلان (١٩٩٤) ت،نورالهدى لوشن،دار الفاضل، دمشق.

١٥- محمد علي الخولي (١٩٩١) معجم علم اللغة النظري، (انكليزي-عربي)، بيروت،لبنان.

١٦- ميشال زكريا (١٩٨٠) الالسنية علم اللغة الحديث،المبادئ والاعلام، بيروت.

١٧- نورالهدى لوشن (١٩٩٥) علم الدلالة،دراسة وتطبيقاً،ط/١، بنغازي، ليبيا.

١٨- وفاء محمد كامل (١٩٩٧) البنيوية في اللسانيات،مجلة عالم الفكر،مجلد (٢٦) العدد (٢٢)،كويت.

## ٣- بەئینگلیزی:

1.JEAN AITICHISON(1993)" Linguistics" Great Britain، Hodder dstonghton

2.SEBASTION LOBNEN(2002) Understanding Semantics ,London,Amold.

3.CRYSTAL,D.(1991) A Dictionary of Linguistics and Ponnetics،Cambredge

## ٤- ئینتەرنێت:

- زمان یەکێ لەگرنگترین ئامێرەکانی پەیوەندی نێوان نەتەوە و نەتەوەکانی تری دنیایە http://zmanikurdi.kurdblogger.com/32746/